**بەرکوڵێک**:

ئەم کتێبەم پتر لە ١٥ بۆ ٢٠ جار خوێندۆتەوە. هەموو جارێک تووشی سەرسووڕمانم دەکا و لە جارەکانی پێشوو زیاتر چێژی لێ وەردەگرم.

**ڕەند زارعی - ٢٠١٩**

randzarei@gmail.com

# پێشەکی لە سەر واریاسیۆنێك

**- 1 -**

ساڵی ١٩٦٨، کاتێك رووسەکان وڵاتە بۆچکۆلانەکەمیان داگیر کرد، گشت کتێبەکانیان لێ قەدەغە کردم و هیچ دەرفەتێکیان بۆ دەستخستنی بژیوی ژیان بۆ نەهێشتمەوە. زۆر کەس ویستیان یارمەتیم بدەن، رۆژێك دەرهێنەرێك هاتە لام و پێشنیاری پێ کردم بەناوی ئەوەوە، شانۆنامەیەکی هەڵێنجراو لە کتێبی "***گەمژە***"[1]ی دۆستۆیۆڤسکی بنووسم.

ئەوە بووە هۆی ئەوە کە جارێکی دیکەش کتێبی "***گەمژە***" بخوێنمەوە. بۆم دەرکەوت، تەنانەت ئەگەر لە برسانیش مردبام، نەمدەتوانی کاری وا بکەم. جووڵە و هەڵسوکەوتی زیادە و بێ-جێ، کەشی نارێك و شێوازە هەستیارە پڕ لە هەڵچوونەکانی دنیای دۆستۆیۆڤسکی دڵساردی کردمەوە. کتوپڕ، لە دڵی خۆمدا هەستم بە سۆز و تاسەیەکی زۆر بەرامبەر بە "***ژاکی هات و نەهات***"[2] کرد.

"هەر بەڕاست، دیدرۆ[3]ت لە دۆستۆیۆڤسکی پێ باشتر نییە؟"

نا، دیدرۆی پێ باشتر نەبوو. لەوەش بترازێ، ئیتر منیش نەمدەتوانی ئەو ورووژانە زۆرەی خۆشم دامرکێنم، نەشدەکرا هەتا ماوم، بە بیری ژاك و ئاغاکەیەوە جینگڵان بدەم. بۆیە، لەجیات ئەوە، بۆ وێناکردنی ژاک و ئاغاکەی دەستم دایە نووسینی شانۆنامەیەک کە بەرهەمی خۆم بێ.

**–2-**

باشە بۆ وا کتوپڕ لە دۆستۆیۆڤسکی رەویمەوە؟

تۆ بڵێی ئەوە کاردانەوەیەکی ئاسایی و سرووشتی دژە-رووسی هاووڵاتییەکی چێکی نەبووبێ دژی داگیرکردنی وڵاتەکەی، وڵاتێک کە تا سەر ئێسقان خۆشی دەویست؟ نا، ناکرێ ئەوە بێ، چونکی من هەمیشە چێخۆڤم خۆش ویستووە. ئەی لەبەر ئەوە نەبوو کە بڕوام بە بەها هونەرییەکانی ئەو بەرهەمانە بوو؟ نا، چونکینێ لەپڕێک و هەر وا لەنەکاو لە دۆستۆیۆڤسکی نەپرینگامەوە و دڵگرێ نەبووم.

ئەوەی منی لە دۆستۆیۆڤسکی رەتاند، کەشی ناو رۆمانەکانی بوو: لە دنیای ناو رۆمانەکانی ئەودا، هەموو شتێك دەبێتە هەستیاربوون و هەستەوەری توخمێکی بنچینەیی ناو رۆمانەکانیەتی. بەواتایەکیتر، لە دنیای رۆمانەکانی ئەودا هەستەوەری تا ئاستی بەها و راستەقینە بەرز دەکرێتەوە.

---

[1] -idiot

[2] - Jacque le fataliste

[3] denis dedetot دێنیس دیدرۆ، نووسەر و فەیلەسووفی فەڕانسەیی (1713 – 1780 ز) و دانەری قامووس (دائره المعارف)-ە.

سێ ڕۆژ بەسەر داگیرکردنی وڵاتەکەمدا تێدەپەڕی کە بە ترۆمبێل، لە پڕاگەوە بەرەو ***بوودەیۆڤیس***[4] دەچووم(شارۆچکەیەکە کە شانۆنامەی"خراپ تێگەیشتنی" کامۆ لەوێ ڕوویداوە). هێزی پیادەی ڕووسی لە سەر جادەکان، لە ناو گشت کێڵگە و دارستان و لە هەموو شوێنێك مۆڵیان خستبوو، لەپڕ ئۆتۆمبیلەکەمیان ڕاگرت و سێ سەرباز دەستیان بە پشکنین کرد. کاتێك پشکنین تەواو بوو، ئەفسەرێك کە ئەمری پشکنینەکەی دابوو، بە زمانی ڕووسی پرسی: "kak chvstvuetes" واتە "***چۆنی! چ هەستێکت هەیە***"! مەبەستی ئەو لە پرسیارەکە، تانە و تەشەر یان شتێکی خراپ نەبوو. بەپێچەوانە. ئەو درێژەی بە قسەکانی دا "گشت ئەم شتانە بە هۆی خراپ لێک تێگەیشتنەوەیە، بەڵام لە داهاتوو هەموو شتێک باش دەبێ. ئێوە دەبێ تێبگەن کە ئێمە خەڵکی چێکمان خۆش دەوێ. ئێمە ئێوەمان خۆش دەوێ".

بە هەزاران تانگ و دەبابەی ڕووسی ناوچە گوندنشینەکانیان خاپوور کردبوو، داهاتووی وڵاتمان بۆ چەند سەدە کەوتبووە مەترسییەوە، ڕێبەرانی چێك بەپانەوە دەستبەسەر و بێسەروشوێن کرابوون، لێ ئێستا ئەفسەرێکی سووپای داگیرکەر هاتووە، سۆز و هۆگری خۆی بۆ مرۆڤایەتی دەردەبڕێ. تکاتان لێدەکەم لێم تێبگەن: ئەو هیچ پێی خۆش نەبوو داگیرکاری وڵاتەکەی خۆی شەرمەزار بکا، نا، تەنانەت بە خەیاڵیشیدا نەدەهات. کەموزۆر گشتیان وەك ئەو دەدوان. سەرچاوەی هەڵسوکەوتیان هەر تەنیا چێژێکی ئازارویستانە و تاڵانکارانە نەبوو، بەڵکو بنچینەی شێوازێکی کۆن و سواوی خۆشەویستی بوو، کە ئەویش ئەوینی یەک لایەنە بوو. وەک بڵێی "باشە بۆچی ئەم چیکییانە(کە ئێمە هێندەمان خۆش دەوێن!) کەچی ئەوان لە هەڵکردن لەگەڵ ئێمە، بەو چەشنە کە ئێمە حەزمان لێیە خۆ دەبوێرن؟ مخابن، ناچارین بە زەبری تانگ و چەک و چۆڵ واتای ئەوینیان تێبگەیەنین"!

- 3 -

مرۆڤ بێ هەست ناژی، بەڵام کاتێک هەستەکان دەبنە پێوەر بۆ پێواوتنی هەقیقەت و پاساودانی هەموو جۆرە هەڵسوکەوتێك، ئیتر ئەوکات هەستەکان دەبنە شتێکی مەترسیدار. ئەوکات، هەست دەبێ بە بەها، دەبێ بە پێوانەی ڕاستی، دەبێ بە پاساوێك بۆ هەموو چەشنە هەڵسوکەتێك، ئەوە شتێکی ترسناکە. ڕەسەنترین هەستی نەتەوایەتی، دەتوانێ پاساو بۆ مەزنترین کارەساتەکان بێنێتەوە و مرۆڤ لەکاتێکدا کە زگی لە زەوق و بزواتێکی بەهەست و خۆشی مۆسیقایی ئاساوە، دەتوانێ بەناو و لەژێر ئاڵای پیرۆزی خۆشەویستیدا کارەسات دەخولقێنێ. کاتێك بیرکردنەوەی لۆژیکی و عەقڵانی جێی خۆی دەدا بە هەستەوەربوون، ئەوکات هەستەوەربوون دەبێتە ماکە و سەرچاوەی سەرەکی نەمانی سۆز و تێگەیشتن و هەڵکردن، وەک کارڵ یۆنگ دەڵێ؛ "دەبێتە بانپێکهاتەکانی خولقاندنی کارەسات".

مێژووی بەرزنرخاندنی هەست تا ئاستی بەها، بۆ سەردەمێکی زۆر کۆن، ڕەنگە بۆ چاخی دابڕانی ئایینی مەسیحییەت لە ئایینی جولەکە بگەڕێتەوە. سێنت ئاگۆستین وتی "هەر خواتان خۆش بوێ، ئیتر هەرچی پێتان خۆشە بیکەن". ئەو وتە بەناوبانگە مەبەستێکی ڕوونی تێدایە: "پێوانەی ڕاستی لە دەرەوە

---

[4] - budegejovice

بۆ ناوەوە". واتە دەیگوازێتەوە بۆ چوارچێوەی دڵخوازی زەین. هەستی لێڵ و ناڕوونی ئەوین "خواتان خۆش بوێ!" (فەرمانی مەسیحییەت) لە جێی روونی و شەفافیەتی یاسای (فەرمانی یەهوودییەت) دەردەکەوێ تا ببێتە پێوەرێکی بێسنوور و نادیاری رەوشت.

**مێژووی کۆمەڵگای مەسیحی قوتابخانەیەکی کۆنی هەستیارییە:**

مەسیح بە لە خاچدرانی فێری کردین ئازارمان خۆش بوێ؛ جوامێری لە هەمبەر ئەویندا دانا، ژیانی بنەماڵەیی دەوڵەمەندانە، تووشی خەمی دوورکەوتنەوە لە ژیانی بنەماڵەیی کردین، دیماگۆژی و هەڵخەڵەتاندنی سیاسی توانیویەتی "سۆزێکی هەستیارانە"مان بۆ گەیشتن بە دەسەڵات تێدا بخولقێنێ. هەر ئەم مێژووە دوور و درێژەشە کە شێوە و وێنایەکی لە سەروەت و سامان، دەسەڵات و جوانی لە هەستەکانماندا دیاری کردوە.

بەڵام لە سەردەمی رێنسانس بەملاوە، رۆحێکی تەواو عەیار، هاوسەنگییەکی بۆ ئەم هەستیاربوون و دڵناسکییەی رۆژئاوا بەرهەم هێناوە؛ واتە رۆحی لۆژیك و گومان، رۆحی یاری و رێژەیی بابەتە مرۆڤایەتییەکان. ئەمە ئەو سەردەمە بوو کە رۆژئاوا بەڕاستی وەخۆ کەوتەوە و وەخەبەر هاتەوە.

سۆلژنیتیسین لە وتارە بەناوبانگەکەی لە زانکۆی هارڤارددا، راستەوخۆ سەرەتای دەستپێکردنی قەیرانی ئێستای رۆژئاوای بردۆتەوە بۆ سەردەمی رێنسانس. بەپێی هەڵسەنگاندنی ئەو، رووسیە وەکو شارستانییەتییەتێکی جیاواز لە رۆژاوا ناوزەد دەکرێ، چونکە مێژووی رووسیە، راست بە هۆی نەبوونی شۆڕشی رێنسانس(بوژانەوە)ەوە لەگەڵ مێژووی رۆژاوادا جیاوازە. بۆیەش، شێوازی بیرکردنەوەی رووسی بەردەوام هاوسەنگی(یا ناهاوسەنگی)یەکی جیاواز لە نێوان عەقڵانییەت و هەستیاریی لە خۆیدا پاراستووە، لەم هاوسەنگی(یا ناهاوسەنگی)یەدا کە نهێنییەکی گرینگی رووسی(قووڵبوونەوە و هەروەها بەرهەمهێنانی توندوتیژی) خۆی حەشار داوە.

کاتێك بارستایی ئەم ناعەقڵانییەتە کەوتە سەر شانوملی نیشتیمانەکەم، هەستم بە پێویستیەکی واریسکەیی و زگماکی کرد کە گیانی رێنسانسی رۆژاوایی رۆ بکەمە ناخی خۆمەوە و وادیارە ئەم گیانەش لە ئاوێتەکردنی عەقڵ و خەیاڵی "ژاکی هات و نەهات"دا نەبێ، لە هیچ کوێیتر هێندە پوخت و کامڵ ئۆقرە نەگرێ.

**-4-**

گەر دەپرسی ئەمن کێم، دەڵێم مرۆڤێکم حەزم لە چێژ وەرگرتنە، لێ کەوتوومەتە نێو گێژاوی ئەو جیهانەی تا قورقۆڕۆچکە سیاسییاندراوە و تێیدا گێژ دەخۆم. ئەوە هەر ئەو دۆخەیە کە لە "***ئەوینە پێکەنیناوییەکان***"یشدا باسم کردوە، کتێبێك کە لە هەموو بەرهەمەکانی دیکەم پتر لام شیرینە و زۆر ئۆگریم، چونکە رەنگدانەوەی خۆشترین قۆناغی ژیانمە. سەیر ئەوەیە کە: سێ رۆژ پێش هاتنی رووسەکان لە کاری دوایین چیرۆکەکانی ئەم کتێبە بوومەوە (کە هەموو ساڵەکانی دەیەی شەست کارم لە سەر کردبوو).

کاتێك چاپی فەڕانسەیی "ئەوینە پێکەنیناوییەکان" لە ساڵی 1970دا بڵاو بۆوە. رەخنەگرەکان وەک بەرهەمێکی سەردەمی رۆشنگەری ناوزەدیان دەکرد. منیش کە لەو هەڵسەنگاندنانە وەک منداڵان هەڵچووم و هرووژام، لەخۆڕا وام لێهاتبوو بڵێم، عاشقی سەدەی هەژدەم. راستیەکەی ئەوەیە ئەوەندەی دیدرۆم خۆش دەوێ، هێندەم سەدەی هەژدە خۆش ناوێ. با بێ پێچ و پەنا بدوێم، رۆمانەکانیم خۆشدەوێ و لە هەمووانیش پتر عاشقی "***ژاکی هات و نەهات***"یم.

لەوانەیە تێگەیشتنێکی لەو جۆرە لە بەرهەمەکانی دیدرۆ شتێک بێ هەر تایبەت بێ بە تاکەکەسی من، بەڵام دەشکرێ وا نەبێ و شتەکە بۆ هەمووان وا بێ. بەبێ دیدرۆی شانۆنامەنووسیش دەتوانین هەر خاسنووس بین، بەبێ خوێندنەوەی پەرتووکەکانی ئەم ئەنسکلۆپێدیانووسە مەزنە دەتوانین لە مێژووی فەلسەفەش تێبگەین، بەڵام - پێی لە سەر دادەگرمەوە-، مێژووی رۆمان بەبێ "***ژاکی هات و نەهات***" شتێکی سەقەت و بێمانایە. دەتوانم لەوەش زیاتر پێ لە بەڕەی خۆم راکێشم و بڵێم ئەم بەرهەمە نەك هەر لە نێو دەقی رۆمانە جیهانییەکاندا هەڵسەنگاندنی پێویستی بۆ نەکراوە، بەڵکو تەنانەت وەك بەشێك لە بەرهەمە بەنرخەکانی دیدرۆش هەقی خۆی پێ نەدراوە و وەک پێویست تاوتوێ نەکراوە. مەزنایەتیی راستەقینەی ئەو بەرهەمە کاتێک دەردەکەوێ کە لەگەڵ بەرهەمگەلێکی وەک ***دۆن کیخۆت***[5] یان ***تام جۆنز***[6]، ***ئۆلیسە***[7] یا ***فریدریك*** دا[8] بەراورد بکرێ.

بەڵام گەلۆ بەراوردکردنی "**ژاکی هات و نەهات**" لەگەڵ بەرهەمەکانی دیکەی دیدرۆ تەنها سەرقاڵیەکی رووتەن بوو و بەس؟ ئایا ئەو بە توندی لە ژێر کاریگەریی هێما بەرزەکەىدا واتە ***تریسترام شاندی***[9] بەرهەمی ***لا رنس ئێسترندا***[10] نەبووە؟

-5-

زۆر جاران ئەوەم دێتە بەر گوێ کە دەڵێن رۆمان تڵپی تەڕی تێدا نەماوە و ئیتر ناتوانێ هەلی نوێ بخولقێنێ. ئەمن وای بۆ ناچم و بەپێچەوانەی ئەو بۆچوونە بیر دەکەمەوە. رۆمان بە درێژایی مێژووی چوار سەد ساڵەی خۆی گەلێک هەلی باشی لەکیس خۆی داوە، نەیتوانیوە هەلی باش برەخسێنێ و گەلێک رێگای نەدۆزیونەوە. ئەمن ناوی ئەوە دەنێم گوێی خۆ لە هۆتاڤان خەواندن.

***تریسترام شاندی*** یەکێك لەم هەلە گەورە لە دەستچووانەیە. ئەم رۆمانە کە **سامۆئێل ریچاردسۆن**[11] پێویستیە دەروونناسیەکانی رۆمانی تێدا دۆزییەوە، بە باشترین شێوە و لە چوارچێوەی نامیلکەیەکدا دایڕشتۆوە و کەڵکی لێ وەرگرتوون. ئەم بەرهەمە، لەلایەکی دیکەشەوە، نیونیگایەکیشی لە کاری ***ئێسترن*** داوەتەوە.

5 - don quixote

6 - tom jones

7 - ulysses

8 - ferdydrke

9 = tristram shandy

10 - louvence sterne

11 - سامۆئیل ریچارد سۆن (1689 - 1761 Samuel Richardson) بناغەدانەری رۆمانی نوێی ئینگلیزی.

تریسترام شاندی قومارکردنە بە ڕۆمان. ئێسترن ڕۆژانی لەدایکبوونی پاڵەوانەکەی بە دووروودرێژی شی دەکاتەوە. ئەم کارەش لەبەر ئەوە دەکا، چونکە زۆر بێشەرمانە دەیهەوێ باس لە ساتەوەختی لەدایکبوونی بکا و بەمشێوە خۆش لە باسەکە دوور بخاتەوە و باسەکە بۆ هەمیشە بەجێ بێڵێ. ئەو لەگەڵ خوێنەردا گاڵتە دەکا و بە رستە نارِازی و بەلارِێدابردنە لەڕادەبەدەرەکان خوێنەر هەڵەشە دەکا و وای لێ دەکا رێی لێ ون بێ. ئەو زنجیرە درامایەک دەست پێ دەکا و قەتیش کۆتایی پێ ناهێنێ، پێشکەشنامە و پێشەکی پەڕتووکەکە دێنێتە نێوەڕاستی کتێبەکەوە و شتی لەو چەشنە دەکا.

با لە کورتی بیبڕێنمەوە: ئێسترن پێکهاتەی چیرۆکی خۆی لە سەر بنەمای بنچینەی یەکیەتیی دانا کە بە بابەتێکی ئاسایی و دووپاتەکراو لەمەڕ دارشتنی ڕۆمان ناسراوە. بە رای ئەو، ڕۆمان یارییەکی گەورەی کەسایەتیە دەستکردەکانە کە ئازادییەکی بێسنوریان هەیە لە کاری داهێنانێکی فەرمیدا.

ڕەخنەگرێکی ئامریکایی بۆ پشتیوانیکردن لە ئێسترن نووسیوویەتی: "تریسترام شاندی ئەگەرچی بەرهەمێکی کۆمدیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، کارێکی جیدییە و لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی هەر جیدیە". لە ئێوە دەپرسم، کۆمێدی جیددی چییە و ئەو کۆمیدیەی کۆمێدی نەبێ چییە؟ ڕەنگە ئەو رستەی هێناومە یەکجار بێ مانا بێ، بەڵام ئەمە نموونەیەکی پڕ بە پێستی ترسێکە کە ڕەخنەی ئەدەبی لە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی نەخوازراو لەگەڵ شتێکدا هەیەتی کە بە رواڵەت جیددی نایەتە بەرچاو.

مادام وایە با منیش لە بنی کولەکەی دەم، بە بڕوای من؛ هەر ڕۆمانێکی خراپ کە ئەم نازناوەی لە سەر بێ، دنیا بە جیددی ناگرێ. جگە لەوەش، هەر بەڕاست "جیددی گرتنی دنیا" واتای چییە؟ واتە، باوەڕپێکردن بەو شتەی دنیا دەیەوێ باوەڕی پێ بکەین، ڕۆمان لە "**دۆن کیخۆتەوە**" بگرە تا "**ئۆلیۆس**" لەگەڵ ئەو شتەدا کێشەیەتی کە دنیا دەیەوێ باوەڕی پێبکەین و بەردەوام لەگەڵ ئەم بابەتەدا بەرەنگار بۆتەوە و مل بە ملەیەتی.

جا ڕەنگە یەکێک بێ و بڵێ: ڕۆمان دەتوانێ لە بڕواپێکردن بەو شتەی دنیا دەیەوێ باوەڕی پێبکەین خۆی بپارێزێ و لەگەڵ ئەوەشدا وەفادار بێ بە راستەقینەبوونی خۆی، کەواتە بۆ ئەوەی جیددی بێت، پێویست ناکا دنیا بە جیددی بگرێ.

جا دەبێ من لە وەختی وادا ئەو پرسیارە بێنمە گۆڕێ کە: بەڵام "جیددی بوون" چیە؟ مرۆڤ لە کاتێکدا جیددیە کە باوەڕی بەو شتە بێ کە دەیەوێ کەسانی دیکە باوەڕیان پێی هەبێ.

ئەمەش راست هەر ئەو کارەیە کە تریسترام شاندی نایکا. لە سەرەتاوە تا کۆتایی تریسترام شاندی جیددی نییە، ناچارمان ناکات باوەڕ بە هیچ شتێکی تایبەتی بکەین: نە راست و دروستی کەسایەتی کاراکتەرەکانی، نە راستی و دروستی نووسەرەکەی و نەڕاستەقینەبوونی ڕۆمانەکەش وەکو شێوازێك لە ئەدەبیات، جیددی نییە. ئەو بەرهەمە، پرسیار دەخاتە سەر هەموو شتێك، بە چاوی شک و گومانەوە سەیری هەموو شتێك دەکا، هەموو شتێك هەر رابواردنە، ئەویش "**ڕابواردنێکی بێ شەرم**" لەگەڵ تەواوی ئەو شتانەی کە پێداویستین بۆ چوارچێوەی ڕۆمان.

ئێسترن ئامرازگەلێکی زۆری بۆ گەشبوونەوە و زیندووتربوونی خۆی لە ڕۆماندا دۆزیوەتەوە و لەم رێگایەشەوە رێچکەیەکی نوێی بۆ کامڵبوون و گۆڕان کردۆتەوە، بەڵام کەس سەرنجی نەدایە و کەس ڕەگەڵ "بانگهێشت بۆ سەفەر"ەکەی نەکەوت، کەس، دیدرۆ نەبێ.

تەنیا ئەو هەڵگری ئەم بانگەوازە نوێیە بوو. بۆیەش دوودڵی لە داهێنان و نوێگەری ئەو، شتێکی بێمانایە و کەس لە سەر داهێنانی کەسێکی وەک رۆسۆ، لاکلو یان گوتە لەو بوارانەی کە ئەوان و گەشەکردنی رۆمان بە گشتی قەرزداری ریچاردسۆنی پیر و ساویلکەن، مشت و مڕ ناکات. ئەگەر وێکچوونی نێوان ئێسترن و دیدرۆ تا ئەو رادەیە جێگای سەرنج بێ، تەنیا لەبەر ئەوەیە کە کارە هاوبەشەکەیان لە مێژووی رۆماندا شتێکی ناوازە و لە گەل هەڵبڕاوە.

-6-

جیاوازییەکانی نێوان "تریسترام شاندی" و "ژاکی هات و نەهات"یش هیچی وایان لە لایەنە وێکچووەکانیان کەمتر نییە.

یەکەم جیاوازیی لە سروشتیان دایە: ئێسترن لەسەرەخۆ و کیسەڵی دەڕواتە پێش، شێوازەکەی کەمکردنەوە لە خێرایدایە، لە رەهەندی نواندنەوە میکرۆسکۆپییە(دەتوانێ کات راگرێ و ساتێکی تاك و تەرا لە ژیان هەڵاوێرێ و جیای بکاتەوە، هەروەك ئەوەی کە جۆیس دواتر کردی).

دیدرۆ بەتاڵووکە و بەپەلەیە، شێوازەکەی زیادکردنی خێراییە، لە رەهەندی نواندنەوە تێلسکۆپیە (هیچ رۆمانێکم پێ شك نایە کە سەرەتاکەی هێندەی لاپەڕە سەرەتاییەکانی "ژاکی هات و نەهات" ئەفسووناوی بێ. دووپاتبوونەوەی شیرین، بە دەگمەن هەڵچوون و داچوونەکان و هەستکردن بە ریتم و ئاوازە خێرا و پتەوەکانی رستە سەرەتاییەکان).

لەوانەش بترازێ، لە پێکهاتەشدا جیاوازن: "تریستردام شاندی" گێڕانەوەیەکی رووتە، واتە لە زمان خودی تریسترام شاندیەوە. ئێسترن زۆر وردبینانە دوای چووکەترین بیرۆکەی هەودای دوورودرێژی بیرەکانی دەکەوێ.

دیدرۆ کەڵك لە پێنج گێڕەوە وەردەگرێ، ئەو گێڕەوانە قسەی یەکتری دەبڕن تا بەسەرهات و سەربردەکانی ناو رۆمانەکە بگێڕنەوە: نووسەر بۆ خۆی (لە وتوویژ لەگەڵ خوێنەرەکەیدا)، ئاغا (لە توویژدا لەگەڵ ژاکدا)، ژاك (لە وتوویژ لەگەڵ ئاغاکەیدا)، خاوەنی میوانخانە(لە وتوویژ لەگەڵ میوانەکان) و مارکی دێزارسی[12]دا. شێوازی زاڵ بەسەر تەواوی ئەم چیرۆکە جیاوازانەدا، ئاخاوتنی پڕ لە مرخی هونەریی و یەکجۆرنەبوونی دیالۆگەکانە. هەر لەو رووەشەوە، راوییەکان هەموو وتوویژەکانیان لە چوارچێوەی دیالۆگدا (ئەو دیالۆگانەی لەگەڵ وتوویژەکانی دیکەدا یەك دەگرنەوە)دەگێڕنەوە. بە گشتی رۆمان شتێك نییە جگە لە رێژەیەکی بەرچاو لە وتوێژی پڕ لە هەرا و هۆریا.

لە گیان و ناخیشدا جیاوازن: کتێبەکەی پارسۆن ئێسترن، لە نێوان شێوەیەکی بنەڕەتی گیانی ئازادبیرانە و گیانی هەست ناسکدایە، بیرەوەرییەکە لە نوستالۆژیکی لە رابواردنی خوێڕییەك لە ژووری پێڵاوداکەندنی پڕ لە سووکایەتی سەردەمی ڤیکتۆریادا.

ڕۆمانەکەی دیدرۆ تەقینەوەی ئازادیەکی رووهەڵماڵاوانەیە و خۆسانسۆڕکردنی تێدا نییە. تەقینەوەی شەهوەتە، بە بێ پەنابردنە بەر هەستەکان.

12 - marquis des areis

دواخریش جیاوازی لە ئاستی وەهمی ریالیستاندا بەرچاو دەکەوێ: ئێسترن پۆلێنەبوونی زەمەنی تێك دەدا، بەڵام لێبڕاوانە ڕووداوەکان لە کات و شوێنی خۆیاندا دەگونجێنێ. کەسایەتیەکانی سەیروسەمەرەن، بەڵام تەیارن بە هەموو چەشنە شتێک تا ئێمە بڕوایان پێبکەین و بڵێین کەسایەتی واله لە دنیای راستەقینەشدا هەن.

دیدرۆ کەشێك دەخوڵقێنێ کە پێشتر قەت لە مێژووی رۆماندا بەرچاو نەکەوتووە: دیمەنێك بە دوور لە رازاندنەوە. کەسایەتییەکان لە کوێوە دێن؟ نازانین ناویان چیە؟ ئەم شتانە، هیچیان پەیوەندی بە ئێمەوە نییە. تەمەنیان چەندە؟ نا، دیدرۆ هیچ هەوڵێک بۆ ئەوە نادا کە ئێمە بڕوا بەوە بێنین کە کەسایەتی لەو چەشنە لە دنیای راستەقینەدا هەن یان نا.

"ژاکی هات و نەهات" بە درێژایی هەموو رۆمانەکە نوێنگەی بنەڕەتیترین دوورخستنەوەی وەهمی ریئالیستی و جواناسیی رۆمانی "دەروونناسی"یە.

## -7-

مەبەست و *رێکارە چڕکراوەکان*، رەنگدانەوەی متمانەی قووڵ و نهێنی سەردەمی ئێمەیە. ئەمە دەبێتە هۆی ئەوە کە بیر لەوە بکەمەوە رۆژێك لە رۆژان سەرلەبەری کولتووری رابردوو بە تەواوی دەنووسرێتەوە و هەر لە کاتی سەرلەنوێ نووسینەوەشیدا لەبیر دەچێتەوە. کەڵك وەرگرتن لە رۆمانە گەورەکان بۆ هێنانە سەر پەردەی سینەما و سێن، شتێك نییە جگە لە جۆرێك "*کتێب خوێندنەوەی چڕکراو*".

مەبەستم بەرگریکردن لە شەرەف و بیرهێنانەوەی رێزگرتن لە بەرهەمە هونەرییەکان نیە. تەنانەت شکسپێریش دووبارەنووسی ئەو بەرهەمانەی کردوە کە کەسانێکی دیکە بەر لە ئەو ئافراندبوویان. هەر چۆنێک بێ، ئەو "*هەڵگرتنەوەی*" نەکرد. ئەو تەنیا بۆ نێوەرۆکی واریاسیۆنەکانی خۆی کەڵکی لەو بەرهەمە هونەرییانە وەردەگرت. ئەو واریاسیۆنانەی بۆ خۆی نووسەری راستەقینە و بێ ئەملاولایان بوو. دیدرۆ هەموو بەسەرهاتەکەی ژاکی لە ئێسترنەوە قەرز کردبوو، هەر لەو بەشە لە بەسەرهاتەکەوە کە ئەژنۆی بریندار بوو، سواری داشقیەیان کرد و بردیان و ژنێکی جوان پەرستاری لێ دەکرد. بەڵام لە کارێکی ئاوادا، لاسایی یان هەڵگرتنەوەی نەکردوە. ئەو واریاسیۆنێکی لە سەر بنەمای نێوەرۆکی ئێسترن نووسی.

لە لایەکی دیکەوە، داڕشتنەوە و هەڵگرتنەوەیەک لە "***ئانا کارانینا***" کە ئێمە لە سەر سێن یان لە سەر پەردەی سینەمادا دەیبینین، واتە کەمکردنەوەی نرخی بەرهەمەکە. وەرگر یان ئەو کەسەی کاری هەڵگرتنەوە دەکا، هەتا پتر هەوڵ بدا کە بە وردبینی و بە قەولی خۆی بە ئەمانەت و پارێزەوە لە پشت رۆمانەکەدا خۆی بشارێتەوە، زیاتر خیانەت بە بەرهەمەکە دەکا. ئەو بە هێنانەخوار و دابەزاندنی نرخی بەرهەمەکە، نەك هەر لە سەرنجراکێشی دەخا، بەڵکو لە واتاش بێبەشی دەکا.

با دوور نەڕۆین، تۆلستۆی بابەتی کرداری مرۆڤی بە شێوازێك لە مێژووی رۆماندا هێنایە گۆڕێ کە هەر لە بنەڕەتدا شتێکی نوێ و تازە بوو. ئەو گرنگی و چارەنووسی هۆکارە لێڵ و ئاڵۆز و بەڕواڵەت لۆژیکیەکانی لە بڕیارداندا دەدۆزییەوە. ***ئانا*** بۆخۆی، خۆی دەکوژێ؟ تۆلستۆی بۆ پەسەندکردنی تۆڕی

ئەو پێویستییە نالۆژیکییانەی کە ژنەپاڵەوانی چیرۆکەکەی بەرەو خۆکوژی هان داوە، تا رادەی کەڵك وەرگرتن لە تاکبێژییەکی دەروونی، تا ئاستی ***جۆیس*** چۆتە پێش. هەر چەشنە هەڵگرتنەوەیەك لەم رۆمانە رێکارێکی چڕکراوە، دەبێ تێبکۆشێ هۆیەکانی کردەوەی ***ئانا*** روون، لۆژێکی و عەقڵانی نیشان بدات، لەبۆیە، وەرگرتن خۆی دەبێتە رەتکردنەوەی رەسەنبوون و رەهابوونی رۆمان.

بەپێچەوانەش: ئەگەر واتا و چەمکی رۆمان لە رەوتی دووبارە نووسینەوەدا بمێنێتەوە، ئەوە ناڕاستەوخۆ بە واتای سەلماندنی ساکاربوونی رۆمانە. لە تەواوی ئەدەبیاتدا دوو رۆمان هەیە کە قەت سادە ناکرێنەوە و بە گشتی قەت ناکرێ سەرلەنوێ بنووسرێنەوە! ئەوانیش، تریسترام شاندی و ژاکی هات و نەهات-ن. چۆن دەکرێ ئەو ناڕێکۆپێکیە پسپۆرانەیە ساکار بکرێنەوە و شتێکی باشی لێ دەرچێ؟ هەر بەڕاست دەبێ چ ئاسەوارێکیان لێ بمێنێتەوە؟

لە راستیدا دەکرێ چیرۆکی ***مادام دوو لا پوومەرێ***[13]ی دەربهاویژرێ و بکرێ بە شانۆنامە یان فیلم. ئەوەی راست بێ، واش کراوە. بەڵام ئەو شتەی لەو کارە دەردەچووە هەر چیرۆکێکی گاڵتەجاڕانەی سووک و ساکارە و هیچ. ئەوەی تێیدا نەبێ، سەرنجڕاکێشبوونە. هۆی ئەوەش ئەوەیە کە ناکرێ جوانی چیرۆکەکە لەو شێوازە گێڕانەوەیەی دیدرۆ جیا بکرێتەوە، 1) ژنێکی ئاسایی زنجیرەی ئەو رووداوانە دەگێڕێتەوە کە لە شوێنێکیتر روو دەدەن و 2) هەموو ئەرکەکانی هاوشێوەکردنی میلۆدراماتیك بە هۆی کەسایەتییەکانەوە و لە رێگای پچڕاندنی جاربەجار گونجاو و نەگونجاوەکانی چیرۆکەکە بە چیرۆکی پێکەنین و بە قسەی دیکە پووچەڵ دەبنەوە و 3)(چیرۆك) بەردەوام تاوتوێ دەکرێتەوە و شیتەڵ دەکرێتەوە و دەخرێتە بەر باس، بەڵام 4) چونکە چیرۆکی مادام دوو لا پوومەرێی، بەرهەمێکی نارەوشتانەیە، بۆیەش هەر کام لە راڤەکەران ئاکامێکی جیاوازی لێ هەڵدێنجن.

باشە بۆچی من هێندەم لێ رست و ئەم گشتە شتەم وت؟ چونکە دەمەوێ هاودەنگ لەگەڵ ئاغاکەی ژاکدا هاوار بکەم: ***"مردن بۆ هەموو ئەوانەی ئەو شتەی نووسراوەتەوە، دووبارە دەینووسنەوە! بیانخەسێنن، گوێیان ببڕن، با ئەتک بن"***.

**- 8 -**

دیارە با ئەوەش بڵێم کە "ژاك و ئاغاکەی" هەڵگرتنەوە نییە. شانۆنامەی خۆمە، "واریاسیۆن"ی خۆمە "سەبارەت بە دیدرۆ" و ئەمەگناسی منە بۆ دیدرۆ، هەر بەو چەشنەش کە داڕێژراوە، "دەربڕی رێزلێنانمە لە دیدرۆ".

ئەم "واریاسیۆن – رێزلێنانە"ە رێککەوتنێکی چەند لایەنە دەخاتەڕوو: پەیوەندی نێوان دوو نووسەر و رووبەڕووبوونەوەی دوو سەدە لەگەڵ یەکتری و وێککەوتنی رۆمان و شانۆیە. فۆڕم و چوارچێوەی بەرهەمی شانۆیی هەمیشە تاڕادەیەکی زۆر نەرمتر بووە لە شکڵ و چوارچێوەی رۆمان. شانۆ قەت "لارێنس ئێسترن"ێکی بە خۆوە نەدیوە. بۆ ئەوەی کۆمیدیەکەم بەپێزتر بێ، کەڵکم لە ئازادیەکی

---

[13] - MADAM DE LA POMMERAYE

رواڵەتی وەرگرتووە کە "دیدرۆ"ی رۆماننووس دۆزیەوە و دیدرۆی شانۆنووس قەت نەیناسی، بەمەش نە تەنیا "رێزم بۆ دیدرۆ" داناوە، بەڵکو "رێزم" لە رۆمانیش گرتووە.

پێکهاتەکەی بەمشێوەیە: لە سەر بنەمای سەفەری ژاك و ئاغاکەی سێ چیرۆکی ئەویندارانە هەڵکەوتوون: چیرۆکی ئەویندارانەی ئاغا، چیرۆکی ئەویندارانەی ژاك و چیرۆکی ئەویندارانەی مادام دوو لاپوومەرێی. یەکەم و دووهەم چیرۆک، لەق و لاوازن و چیرۆکی دووەم بەشێوەیەکی زۆر لاواز لەگەڵ ئاکامی سەفەرەکەدا لە پەیوەندی دایە، چیرۆکی سێیەم کە تەواوی پەردەی دووەم دەگرێتەوە، لە بواری روانگەی تیکنیکیەوە تەنیا گێڕانەوەیەکی ناتەواوە لە رووداوە سەرەکیەکان کە بە تەواوی لەگەڵ ئەوانیش یەک ناگرێتەوە. ئەمە سەرپێچیکردنێکی ئاشکرایە لە یاساکانی پێکهاتەی شانۆیی. بناغەی کارەکەم ئاوا دارشتوە:

بەخۆ دوورخستنەوە لە یەکانگیربوونی کردەوەی نەگۆڕ، ویستوومە بە کەرەسەیەکی ناسکتر کۆکراوەیەکی یەکگرتوو و رێکوپێك پێك بێنم: لە رێگای تیکنیکی فرە-دەنگییەوە، لە جیاتی ئەوەی زیاتر باری گێڕانەوەیان هەبێ، تێکهەڵکێشم کردوون و تیکنیکی واریاسیۆنەکە وایە کە (هەر کام لەو سێ چیرۆکە لە راستیدا واریاسیۆنێکە سەبارەت بە چیرۆکەکانی دیکە). (کەواتە ئەم شانۆنامەیە کە "واریاسیۆنێکە سەبارەت بە دیدرۆ"، هاوکات "دەربڕی رێزە بۆ تیکنیکی واریاسیۆن"یش، هەروەها رۆمانەکەی حەوت ساڵ دواترم، "کتێبی پێکەنین و لە بیرچونەوە"ش هەر بەو شێوەیە).

**- 9 -**

ئەوە بۆ نووسەرێکی خەڵکی وڵاتی چێك لە ساڵەکانی دەیەی 1970دا شتێکی زۆر تاڵ و جەرگبڕ بوو کە تەنانەت هەر بە بیریش، بیر لەوە بکاتەوە کە کتێبی "ژاکی هات و نەهات"(کە ئەویش لە ساڵەکانی دەیەی حەفتادا نووسرابێ) قەت لە ماوەی ژیانی نووسەرەکەیدا بڵاونابێتەوە و دەستنووسەکەی لە بن تۆزدا ون دەبێ و ئەگەر خوای کرد و شانس و بەخت رووی تێ کرد، ئەوا دەستنووسەکەی هەر لە ناو کۆڕی ناسیار و ناسیاواندا دەستاودەست دەکا.

ئەو شتەی تەنانەت لە سەردەمی دیدرۆشدا شتی وا نەبووە و رووی نەداوە، کەچی دوو سەد ساڵ دواتر هەر ئەو دیاردەیە لە پراگ، بووە چارەنووسی هەموو نووسەرە گەورەکانی چێکی ئەو سەردەم. فکری لێ بکەوە، نووسەرە چێکییەکان تەنیا بە شێوەی دەستنووس و پیتچن، دەیانتوانی شتەکانیان بڵاو بکەنەوە و بیخەنە بەر دەستی خوێنەرانیان. ئەم دۆخە نالەبارە، بەرهەمی هێرشی رووسەکان بوو و لەگەڵ داگیرکاری رووسەکان وامان لێ قەوما و ئێستاشی لەگەڵ بێ هەر وا درێژەی هەیە (تا کاتی نووسینی ئەم کتێبەش)، وادیارە هەر واش دەبێ و هەر واش درێژەی دەبێ.

"ژاك و ئاغاکە"ییم بۆ دڵخۆشی خۆم و بەم هەموو دڕدۆنگی و دوودڵییەوە نووسی، بەڵکوو خوایکرد و رۆژێک لە رۆژان بکرێ بە ناوێکی خوازراوەوە و لە یەکێك لە شانۆکانی چێکدا چووە سەر سێن. لە پەراوێزی دەقەکەمدا، لە جیاتی واژۆ کە بۆ وەبیرهاتنەوەی بیرەوەرییەک لەسەر هەموو کتێبەکانی دیکەشم دەمنووسین، چەند خاڵێکم بەدوای یەکدا دانا (یارییەکی دیکە، واریاسیۆنێکی دیکە!): "ژاك و ئاغاکەی" وەبیرهێنەرەوەی دوو هاوڕێی خۆشەویستن بۆ من، واتە "**سێوی زێڕینی هەوەسی بێ کۆتایی**"

(ئەوینە پێکەنینییەکان). لەم بەرهەمەدا، ئاماژەیەك بە "ژیان لە شوێنێکی دیکە"دایە و ئاماژەیەکی دیکەشە بە "ئاهەنگی ماڵئاوایی". بەڵێ، ئەوانە یادگاری بوون، تەواوی شانۆنامەکە ماڵئاوایی لەژیانم بوو. وەکو نووسەرێك ماڵئاواییەك بوو لە شێواز و چوارچێوەی شانۆیەکی سەرقاڵکەر. بڕیار وابوو "ئاهەنگی ماڵئاوایی"، ئەو ڕۆمانەی کە دەتوانم بڵێم دەکرا دوا-ڕۆمانم بێ. بەو وەسفەی کە بێ ئەوەی تامی تاڵی تێکشکانی تاکەکەسی بچێژم ئەو قۆناغەم تێپەڕ کرد، ماڵئاوایی تایبەتیی و پڕ لە هەستم بەرەبەرە لەگەڵ ماڵئاواییەك کە زۆر مەزنتر و لە چاوەڕوانییەکانم زیاتر بوو، تێکەڵ بە یەك بوون:

ئەوەی من لە پراگ ئەزموونم کرد و دیتم ئەوە بوو کە؛ لە هەمبەر شەوەزەنگی تاریکی رووسەکاندا، بەرەبەیان و خۆرەتاوی کولتووری ڕۆژاوا ڕاوەستا بوو کە ئەویش لە سەر بنەمای تاك و لۆژیکی بیرکردنەوەی بەکۆمەڵ و ڕێسا و زانین چەقی بەستبوو. لە وڵاتێکی بچووکی ڕۆژئاوادا، کۆتایی ڕۆژاوام بینی. ئەوە ماڵئاوایەکی مەزن بوو.

**-10-**

ڕۆژێك دۆن کیخۆت سەفەرێکی لەگەڵ دێهاتیەکی نەخوێندەواردا دەستپێکرد کە زۆرتر لە نۆکەری خۆی دەچوو تا هاوسەفەر. سەدوپەنجا ساڵ دواتر، *توبی شاندی* باخەکەی خۆی کردە گۆڕەپانی شەڕێکی دەستکرد، لەوێ کاتەکانی خۆی بە قسەکردن سەبارەت بە بیرەوەرییەکانی سەردەمی لاوێتی خۆی لە سوپا و سەربازی ئەفسەر **تریم**[14] ڕابوارد کە وەفادارانە لە خزمەتیدا بوو. تریم شەل بوو و دەشەلی، زۆر لە ژاك دەچوو، ئەو ژاکەی دە ساڵ دواتر لە سەفەردا بووە هۆی گەپجاڕی و سەرقاڵبوونی ئاغاکەی. ئەو وەک سەربازی **شوایك**[15] کە سەدوپەنجا ساڵ دواتر لە سوپای هەنگاریدا بووە هۆی سەرگەرمی و ترسی فەرماندەکەی، واتە پلەدار **لوکاك**، ژاکیش هەر بەو چەشنە، خۆی وەک کەسێکی لاژگ و خۆبەزلزان دەنواند. سی ساڵ دواتر، ویلادیمێر و نۆکەرەکەی "**لە چاوەڕوانی گۆدۆدا**" لە گۆڕەپانی چۆڵی دنیادا، بە تاقی تەنیا و تاک و تەرا مانەوە. ئیدی ئەمە کۆتایی سەفەر بوو.

نۆکەر و ئاغا سەرانسەری مێژووی نوێی ڕۆژاوایان پێواوە. لە پراگ، شاری ماڵئاوایی مەزن، دەنگی پێکەنینی کز و لاوازیانم کەوتە بەر گوێ. بە ئازارەوە بەو پێکەنینەوە نووسام، ڕاست بەو شێوەی کە مرۆڤ دەست لە ملی ئەو شتانە دەکا کە زۆری خۆش ویستوون، بەڵام بە هۆی ئەوەی نکۆڵییان لێ دەکرێ و ڕەت کراونەوە، ئەو شتانەمەحکومن بە لەناوچوون.

**"پاریس – ژوئیەی 1981"**

---

[14] - corporal trim

[15] - sodier srcik

# ژاك و ئاغاكەی

## كەسایەتییەكان:

ژاك
ئاغای ژاك
خاوەنی میوانخانە
شوالیە دۆ سێن-ئۆوێن[16]
بیگری لاو[17] و بیگری پیر[18]
ژووستن
ماركی[19]
دایك
كچ
ئاگات[20]
دایكی ئاگات
باوكی ئاگات
ئەفسەری پۆلیس
بیلیف[21]

---

16 - chevalier de soint - ouen
17 - young bigre
18 - ode bigre
19 - marquis
20 - agathe
21 - bailiff

**چەند تێبینییەک**(-ی نووسەر) **بۆ باشتر بەڕێوەچوونی شانۆنامەکە:**

دەبێ شانۆنامەکە بێ راوەستان بەڕێوە بچێ.

* ژاك وەك پیاوێکی چل ساڵە دێنمە پێش چاوم. ئاغاکەشی هاوتەمەنی ئەو یان تەنانەت هێندێك لەو گەنجترە.

فرانسو گێرامۆن[22] کە دەرهێنەری نواندنێکی سەرکەوتووانەی ئەم شانۆنامەیە بوو لە ژنێڤ، بۆچوونێکی جێی سەرنجی هەبوو: کاتێك لە سەرەتای پەردەی سێهەمدا ژاك و ئاغاکەی لە سێنی شەشەم دووبارە تووشی یەکتر دەبنەوە، ئیتر پیر بوون، واتە چەندین ساڵ بەسەر دیمەنی پێشوودا تێپەڕیوە.

* لە سەرتاسەری شانۆکەدا دیمەنی سەر سێن ناگۆڕدرێ و هەر بەو شێوەیە دەمێنێ کە بووە.

سێنەکە بە سەر دوو بەش دابەش دەکرێ:

1- بەشی خوارەوەی دیمەن، لە خوارەوەیە.
2- بەشی سەرەوەی دیمەنەکە بەرزترە و لە سەر سەکۆیەکی گەورەیە. هەموو ئەو رووداوانەی لە کاتی ئێستادا روو دەدەن لە سەر دیمەنی خوارەوە نیشان دەدرێن: بەش و ئاڵقەکانی کاتی رابردووش لە دیمەنی سەرەوە روو دەدەن.

لە کۆتایی دیمەنی سەرەوە (واتە لە سەر سەکۆکە) قادرمە (یان پەیژە)ی لێیە کە دەچێتە ژووری بەر هەیوانەکە.

زۆربەی کاتەکان دیمەنەکە(کە دەبێ زۆر ساکار بێ) بە تەواوی چۆڵە. هەربۆیە ئەکتەرەکان بۆ هێندێك لە ئاڵقەکان مێزو کورسی و... دێنن.

سەفەرەکە دەبێ بەدوور بێ لە هەر چەشنە رازاندنەوە، شیکردنەوە و هێمایەکی تایبەتی: ئەم جۆرە شتانە لەگەڵ کەشی شانۆنامەکەدا ناگونجێن، هەروەك هەر چەشنە زێدەکارییەک لە کاری نواندنیشدا دەبێتە شتێکی زیادە.

ڕووداوەکان لە سەدەی هەژدەدا، بەڵام ئەو سەدەی هەژدەیەی کە ئەمڕۆ دێتە بەرچاومان روو دەدەن. هەروەك مەبەستی زمانی(ئاخاوتنی) شانۆنامەکەش ئەوە نییە کە رەنگدانەوەی ئەو قۆناغە بێ، دیمەنی رازاندنەوە و جلوبەرگەکانیش نابێ پێ لە سەر ئەو سەردەمە داگرن. لایەنی مێژوویی کەسایەتییەکان (بە تایبەتی دوو پاڵەوانەکەی چیرۆکەکە) لەگەڵ ئەوەی بە هێچ شێوەیەك باسیان لە سەر ناکرێت دەبێ تا رادەیەك لێڵ و ناڕوون بن.

---

[22] - francois germond

# پەردەی یەکەم

## دیمەنی یەکەم

*(**ژاك** و **ئاغاکەی** وەژوور دەکەون. چەند شەقاوێك هەڵدێننەوە، ژاك چاو لە بینەران دەکا و لەپڕ رادەوەستێ).*

**ژاك:** *(بە پارێزەوە دەدوێ)* گەورەم... *(لەگەڵ ئەوەدا کە بینەران نیشان دەدا)* باشە تۆ بڵێی بۆچی ئەوانە ئاوا زەق زەق لە ئێمە راماون؟

**ئاغا:** *(تاڕادەیەك راچەنیوە، جلەکانی رێك و پێك دەکا. دەڵێی لەوە دەترسێ کە بە هۆی نارێکوپێکی سەر و سەکتی سەرنجراکێش بنوێنێ)* خۆتیان لێ گێل بکە، وەبزانە کەسی لێ نییە.

**ژاك:** *(بە ئامادەبووان دەڵێ)* ناتانهەوێ چاو لە شوێنێکی دیکە بکەن؟ زۆر باشە. دەتانهەوێ چی بزانن؟ ئەوە کە ئێمە لە کوێوە هاتووین؟ *(بە دەستی راست ئاماژە بۆ پشت ەسەری دەکا)* لەوێوە. دەچینە کوێ؟ *(فەیلەسووفانە)* باشە من لە ئێوە دەپرسم، هەر بە راست، ئێمە کێهامان دەزانین بەرەو کوێ دەچین؟*(بە بینەران دەڵێ)* دا پێم بڵێن بزانم، ئێوە دەزانن بۆخۆتان بۆ کوێ دەچن؟

**ئاغا:** بە داخەوە من دەزانم دەچینە کوێ ژاک.

**ژاك:** بەداخەوە؟

**ئاغا:** *(بە خەمناکییەوە)* بەڵێ، بەڵام قەت نامەوێ نهێنییە پڕ لە خەم و داخەکانم بە تۆ بڵێم.

**ژاك:** گەورەم، بڕوام پێ بکە ئێمە هیچ کاممان نازانین دەچینە کوێ. بڕوام پێ بکە، باشە... بە وتەی ئەفسەرە خۆشەویستەکەم:"**هەموو شتێك لەو سەری-سەرانەوە نووسراوە**..."

**ئاغا:** قسەکەی راست بووە.

**ژاك:** هەی بە نەفرەت بن ژووستین و ئەو ژوورە دڵگرەی بەر هەیوانە کە لەوێدا کوڕێتی خۆم لە دەست و تێیدا بوومە پیاو!

**ئاغا:** ژاک، بۆچی ژنەکە بە نەحلەت دەکەی؟

**ژاک:** چونکە هەر ئەو ڕۆژەی کوڕێتیم لە دەست دا، چوومە دەرێ و شەش دانگ خۆم مەست کرد. باوکم هێندە تووڕە بوو، بە دەستمەوە شێت ببوو، چەخستێکی چاکی تێهەڵدام. پۆلێک سەرباز بەوێدا تێدەپەڕین، چوومە ریزیانەوە و رەگەڵیان کەوتم، لەپڕ شەڕ دەستی پێکرد، گوللەیەك بەر ئەژنۆم کەوت. هەر ئەوەش سەرەتای هەودای ئەو سەربردە دوورودرێژەمە، وابزانم ئەگەر ئەو گوللە نەبووایە قەت عاشق نەدەبووم...

**ئاغا:** هەر بەڕاست عاشقیش بووی؟ ئەتۆ قەت باسی ئەوەت بۆ من نەکردوە.

**ژاک:** گەورەم، گەلێك شت هەن قەت پێم نەگوتووی.

**ئاغا:** باشە چۆن بوو عاشق بووی؟ دا بۆم بگێڕەوە!

**ژاک:** باسی چیم دەکرد؟ ئەها، بەڵێ. گوللەیەکم لە ئەژنۆ درا. لە ناو کۆگایەک لە مردوو و برینداردا بووم. ڕۆژی دواتر دۆزیانمەوە و لە داشقەیەکیان هاویشتم. ئەو ڕێگایەی دەچووە نەخۆشخانە پڕ لە چاڵ و چۆڵ بوو. بە بچووکترین تاسە لەتاو ژانی قاچم زیقەم لێ هەڵدەستا. لەپڕ راوەستاین. تکام کرد دامبەزێنن. لە نزیك گوندێك بووین و چاوم بە ژنێکی لاو کەوت کە لەنێو دەرگای کۆخێکدا راوەستا بوو...

**ئاغا:** دەییی! ئێستا تێگەیشتم.

**ژاک:** ژنەکە چووە ناو کۆخەکەوە، بە قاپێك شەرابەوە گەڕایەوە و سەری قاپە شەڕابەکەی لە زارم تەپاند. ویستیان سەرلەنوێ سواری داشقەکەم بکەنەوە، بەڵام من تووند لە دامێنێ ژنەکە نووسام. پاشان لە هۆش چوومەوە، کە وەهۆش هاتمەوە لە ناو کۆخەکەدا بووم، مێردەکەی و منداڵەکانی دەورەیان دابووم، ژنەکەش خەریکی نەشتەرگەری برینەکەم بوو.

**ئاغا:** بەڕاستی تۆ کەرەپیاوێکی لاپەرەسەن و پیسی! دەزانم کۆتایی کارەکە چی بووە!

**ژاک:** گەورەم، ئەگەر دەتزانی چ ڕوویداوە، قەت شتی وات نەدەگووت!

**ئاغا:** پیاوێك ڕێی داوی بچییە ماڵەکەی. تۆش ئاوا وڵامی چاکە و میواندارییەکەت داوەتەوە!

**ژاک:** باشە بۆ مەگین ئەوەی ئێمە دەیکەین بە دەست خۆمانە؟ وەك ئەفسەرەکەم دەیگوت: "**گشت ئەو کارە چاك و خراپانەی ئێمە لەم خوارەوە دەیکەین، پێشتر هەموویان لەو سەرسەرەوەیە نووسراون**". گەورەم، هەر بەڕاست چ ڕێگایەکت بۆ سڕینەوەی ئەوەی لەسەرەوە نووسراوە پێ شك دێ؟ باشە من دەتوانم هەر نەبم؟ دەتوانم کەسێکی دیکە بم؟ یان لەگەڵ ئەوەدا کە من بۆخۆم بم، گەلۆ جگە لەوەی کە بۆم دیاریکراوە بیکەم، دەتوانم کاری دیکەش بکەم؟

**ئاغا:** ئەمن وەختە لە داخی شتێك بتەقێم: باشە تۆ لەبەر ئەوە کە لەو سەر سەرەوە نووسراوە کەسێکی سەگ و سەگبابی یان ئەوە کە چونکە لەو سەر سەرەوە دەیانزانی کەسێکی سەگبابی ئەوەیان نووسیوە؟ کامیان راستە؟

**ژاک:** ئەمن ئەوەی نازانم گەورەم، بەڵام گەورەم نابێ تۆ پێم بڵێی سەگ و سەگباب...

**ئاغا:** کەسێك کە خیانەت لە پشتیوانەکەی بکا...

**ژاک**:...یان ئەو پیاوەی پشتیوانی لە من دەکا سەگبابە. خۆزگە گوێت لێ دەبوو لەبەر ئەوەی هاوسەرەکەی بەزەیی بە مندا هاتبوو چۆنی زەجر دەدا... چی ناخۆش بوو پێی دەگوت.

**ئاغا:** حەقی بووە... باشە، پێم بڵێ شێوەی چۆن بوو. تاریفی بەژن و باڵای ژنەکەم بۆ بکە.

**ژاک:** ژنێکی لاو؟

**ئاغا:** دەی.

**ژاک:** (*پاش ساتێك بێدەنگی*) بەژن و باڵای رێک و مامناوەند...

**ئاغا:** (*ئەوەی زۆر بەدڵ نەبوو*) قووڵەخڕە...

**ژاک:** لە راستیدا نێوەنجیەکی تۆزێک بەرز...

**ئاغا:** (*لەکاتێکدا سەری بە نیشانەی کەیف پێ هاتن دەجووڵێنێ*) تۆزێک بەرز...

**ژاک:** بەڵێ.

**ئاغا:** جا ئەمن کەیفم بە ژنی وا دێ.

**ژاک:** (*بە دەستەکانی شێوەی شتێك نیشان دەدا*) ئەوە تەختی سینگی بوو.

**ئاغا:** سینگ و مەمکی پانتر بوو یان گەڵ و قوونی؟

**ژاک:** (*بە دوودڵیەوە*) مەمکی.

**ئاغا:** (*بە خەمناکیەوە*) پێم ناخۆشە.

**ژاک:** کەواتە تۆ کەیفت بە گەڵ و قوونی گەورە دێ؟

**ئاغا:** بەڵێ... گەڵ و قوون دەبێ وەک هی ئاگات گەورە بێ... چاوی؟ ئەی چاوی چۆن بوون؟

**ژاک:** چاوەکانی؟ لە بیرم نەماوە. بەڵام قژی رەش بوو.

**ئاغا:** بەڵام قژەکانی ئاگات زەرد بوون.

**ژاک:** باشە بە من چی ئەو هیچی لە ئاگاتی تۆ ناچێ؟ دەبێ هەر بەو شێوەیەی کە هەیە پێی رازی بی. بەڵام لاقی جوان و درێژ بوون.

**ئاغا:** (*دەڵێی بیر دەکاتەوە*) لاقی درێژ. بەڕاستی ئەوە زەوقم هەڵدەستێنێ!

**ژاک:** قوونێکی گەورە و پان و پۆڕ.

**ئاغا:** گەورە؟ بەڕاستی؟

**ژاک:** (*لەکاتێکدا نیشانی دەدا*) ئەوەندە دەبوو...

**ئاغا:** هەی سەگباب! هەتا زیاتر باسی ئەوم بۆ دەکەی، توڕەتر دەبم... ئەوە ژنی ئەو پیاوە بووە کە پشتیوانت بوو، جا تۆش چووی...

**ژاک:** نا، گەورەم، هیچ شتێك لە نێوانماندا رووی نەدا.

**ئاغا:** ئەدی بۆ باسی دەکەی؟ هەر بۆ ئەوەی سەری منی بێشێنی؟

**ژاک:** ئاغا، تۆ هەمیشە قسەم پێ دەبڕی و دێیە نێو قسەکانمەوە. بەڕاستی ئەوە خوویەکی زۆر زۆر خراپە.

**ئاغا:** بە ئەنقەست وا دەکەم...

**ژاک:** ئەمن دەڵێم ئەژنۆم گوللەی لێ درابوو، لە جێدا کەوتبووم و لەتاو ژان ئازارم دەچەشت، ئەتۆش تەنها ئەو شتەی بیری لێدەکەیتەوە هەوەسەکانتە. ئاگاتیش، کەیفی خۆیەتی کێیە.

**ئاغا:** ناوی مەهێنە.

**ژاک:** تۆ خۆت ناوت هێنا...

**ئاغا:** قەت رێکەوتووە لە ناخی دڵەوە ژنێکت خۆش ویستبێ و ئەو دەستی نابێ بە رووتەوە؟ قەت وا بووە؟

**ژاک:** بەڵێ، ژووستین.

**ئاغا:** ژووستین؟ هەر ئەو کچۆڵەی لێی بووی بە پیاو؟

**ژاک:** بەڵێ.

**ئاغا:** باسی ئەوم بۆ بکە...

**ژاک:** باشە گەورەم، بەڵام پێش ئەوە، تۆش بەسەرهاتی خۆتم بۆ بگێڕەوە.

## دیمەنی دووەم

*(چەند ئەکتەرێك لە سەر سەکۆی سێنی سەرەوە لە جێگای خۆیان راوەستاون، بیگری لاو، لە سەر قادرمەکان دانیشتووە، ژووستین لە تەنیشتی راوەستاوە. لە بەرامبەری سێنەکەدا ئاگات لە سەر کورسیەك دانیشتوە کە شووالیە دۆ سێن-ئۆوێن بۆی هێناوە، شووالیە لە تەنیشتی راوەستاوە).*

**سێن-ئۆوێن:** (*ڕووی دەمی لە ئاغایە*) سڵاو هاوڕێیان!

**ژاک:** (*هاوکات لەگەڵ ئاغاکەی ئاوڕ دەداتەوە، بە سەر ئاماژە بۆ ئاگات دەکا*) ئەوەتا خۆیەتی؟ (*ئاغا بە نیشانەی بەڵێ سەری دەجوڵێنێ*) ئەو پیاوە کێیە لە تەنیشتی راوەستاوە؟

**ئاغا:** هاوڕێمە، دۆ سێن– ئۆوێنی سەربازە، هەر ئەو کەسەی ئێمەی بە یەکتری ناساند. (*چاو لە ژووستین دەکا*) ئەوەی دیکە کێیە، کچە خۆشەویستەکەی تۆیە؟

**ژاک:** بەڵێ، بەڵام من زیاتر خۆشیم لەوەی تۆ دێ.

**ئاغا:** منیش هی تۆم پێ باشترە، بەخۆوەترە. باشە پێت چۆنە گراوییەکانمان بگۆڕینەوە؟

**ژاک:** دەبوو زووتر بیرت لەوە کردبایەوە. ئێستا زۆر درەنگ بووە.

**ئاغا:** (*ئاهێکی بۆ هەڵدەکێشێ*) راستە. زۆر درەنگە. ئەدی ئەو پیاوە بەهێز و چوارشانە کێیە؟

**ژاک:** ئەوە بیگرە، دۆستێکی لەمێژینەمە. هەردووکمان وەدوای ئەو کچە دەکەوتین، بەڵام بە هێندێك هۆ ئەو بە کچەکە گەیشت.

**ئاغا:** راست وەکو بەسەرهاتەکەی من.

**سێن-ئۆوێن:** (*لە کاتێکدا کە هەتا لێواری سەکۆکە بەرەو لای ئاغا دەچێ*) پیرەکوڕ، دەبێ زیاتر ئاگای لە خۆی بێ. دایک و باوکەکان نیگەرانی ئابڕووی کچەکانیانن...

**ئاغا:** ( *بە ناڕەحەتییەوە روو لە ژاك دەکا* ) ئەوانە بازرگانی بە کچەکەیانەوە دەکەن! ئەگەر دیاریم بۆ بردبانایە زۆریان پێ خۆش دەبوو!

**سێن-ئۆوێن:** نا، نا، تۆ تێناگەی! ئەوان زۆر رێز لە تۆ دەگرن. تەنیا چاوەڕوانیان لە تۆ ئەوەیە کە مەبەستی خۆت نیشان دەی و دڵنیایان بکەیەوە. ئەگەر وا نەکەیت نابێ بچیە ئەوێ.

**ئاغا:** (*ڕوو لە ژاك کە گۆڕاوە* ) کە بیر لەوە دەکەمەوە کە ئەوە ئەو بوو منی بەو ناساند! ئەو بوو هانی دەدام! ئەو بوو کە بەڵێنی دا زۆر هاسان بۆم ساز کا!

**سێن-ئۆوێن:** هاوڕێم، من راسپاردەم و هیچم لە سەر نییە.

**ئاغا:** (*بە سێن-ئۆوێن دەڵێ*) زۆر باشە. (*دەچێتە سەر سەکۆ*) کەوایە پەیامی منیان پێ بگەیەنە. جارێ حیساب لە سەر من مەکەن. بە ئاگات بڵێ ئەگەر دەیەوێ من لە دەست نەدا، باشتر وایە لە داهاتوودا بە بەزەیتر بێ لەگەڵم. بە هیچ شێوەیەك نامەوێ پارە و کاتم لەگەڵ ئەو بە فیڕۆ بدەم، لانیکەم دەتوانم پارەکانم بۆ شتی دیکە بەکار بێنم.

*(سێن-ئۆوێن گوێ لە قسەکانی رادەگرێ، کڕنۆش دەبا و دەگەڕێتەوە سەر شوێنی خۆی - لە پشتەوەی ئاگات رادەوەستێ).*

**ژاك:** هەی بژی ئاغا، کە ئاوات لێ دێ، ئەمن کەیف دەکەم. جاروبار ئازا و بەجەرگ بە.

**ئاغا:** (*لە سەر سەکۆوە رووەو ژاك* ) لە ژیانماندا چەند جارێکمان دەستگەرمی کردوە و چوومە ژوانی. دوای ئەوە، ئیتر قەت بەلایدا نەچوومەوە.

**سێن-ئۆوێن:** (*لەکاتێکدا لە درێژەی نیمچە بازنەیەکدا دووبارە بەرەو ئاغا دەچێ*) پەیامەکەتم دەقاودەق پێگەیاند، بەڵام ئەگەر راستیت دەوێ، تۆش هێندێك دڵڕەق بووی.

**ژاك:** ئاغای من دڵڕەقە؟

**سێن-ئۆوێن:** کوڕە بەر بە زارت بگرە! (*بە ئاغا دەڵێ*) گەورەم بێدەنگی تۆ هەموو بنەماڵەی تووشی سەرسوڕمان کردووە. ئاگاتیش...

**ئاغا:** ئاگات چی؟

**سێن-ئۆوێن:** ئاگات دەگری.

**ئاغا:** دەگری.

**سێن-ئۆوێن:** گریان و شیوەن بۆتە پیشەی هەموو رۆژێکی.

**ئاغا:** بە بڕوای تۆ ئەگەر ئێمە سەرلەنوێ چاومان بە یەکتر بکەوێتەوە؟

**سێن-ئۆوێن:** نابێ، ئەوە کارێکی هەڵەیە. نابێ پاشەکشە بکەی. بە گەڕانەوەت بۆ لایان هەموو شتێك دەدۆڕێنی. دەبێ ئەو بازرگانانە فێری ئەدەب و ڕەوشت بکەی.

**ئاغا:** بەڵام ئەگەر ئیدی قەت داوام لێ نەکەن بگەڕێمەوە چی بکەم؟

**سێن-ئۆوێن:** داوات لێ دەکەن.

**ئاغا:** ئەگەر ماوەیەکی زۆری پێ چوو ئەوجار چی؟

**سێن-ئۆوێن:** دەتەوێ ئاغا بی یان کۆیلە؟

**ئاغا:** گوتت دەگری...

**سێن-ئۆوێن:** باشتر وایە ئەو بگری نەك تۆ.

**ئاغا:** ئەگەر قەت داوام لێ نەکا بگەڕێمەوە چی بکەم؟

**سێن - ئۆئێن:** باوەڕت بە قسەی من بێ، ئەوە نییە پێت دەڵێم تکات لێ دەکەن، ئێستا کاتی ئەوەیە کە ئەوپەڕی کەڵك لەو هەلە وەرگری. ئاگات دەبێ لەوە تێبگا کە تۆ ئامادە نی بە تەواوی ملکەچی بی، دەبێ هەوڵ و تەقەلایەکیش بدا... بەڵام باشە تۆ پێم بڵێ بزانم ... ئێمە هاوڕێی یەکترین، مەگین نا؟... بەڵێنی شەرەفم بدەیە کە تۆ و ئەو...

**ئاغا:** نا.

**سێن-ئۆوێن:** نهێنی پارێزی تۆ نیشاندەری بە شەرەف بوونتە.

**ئاغا:** نا، بە هیچ شێوەیەك. چۆن بووە ئاوام پێ گوتی.

**سێن-ئۆوێن:** چۆن؟ یانی تەنانەت قەت بۆ ساتێکیش دڵسارد نەبوویەوە؟

**ئاغا:** قەت.

**سێن-ئۆوێن:** سەیرە، من پێم وایە تۆش وەک پێویست بێ خەوش و پاك نەبووی لەگەڵی.

**ئاغا:** ئەتۆ چی، سەرباز؟ قەت عاشقی نەبووی؟

**سێن-ئۆوێن:** با، چۆن نەبووم. بەڵام هەر ئەو کاتە کە تۆ هاتی، لەبەرچاوی ئاگات کەوتم. ئاخ. ئێمە ئێستاش هەر هاوڕێیانێکی باشین بۆ یەکتری، بەڵام بەوە دڵخۆش دەبم کە ئەگەر باشترین هاوڕێم لەگەڵی بنوێ، هەست دەکەم بۆخۆم لەگەڵی چوومە ناو جێگاوە. بڕوات بێ بە قسەکانم. هەموو هەوڵی خۆم دەدەم کە پێی بگەی و لەگەڵی بنووی.

*(لە کۆتایی قسەکانیدا بە ئارامی بۆ لای ئەو کورسییە کە هێشتا هەر ئاگات لەسەری دانیشتووە دەگەڕێتەوە).*

**ژاك:** ئاغا چاوت لێیە من گوێگرێکی چەندە باشم؟ تەنانەت بۆ جارێکیش نەهاتمە ناو قسەکانتەوە. خۆزگە تۆش قەت قسەت بە من نەبڕیبایە.

**ئاغا:** هەر بۆ ئەوە هاتییە ناو قسەکانمەوە کە پێم بڵێی قسەت پێ نەبڕم.

**ژاك:** لەبەر ئەوە قسەکەتم بڕی تا بزانی چەندە خوویەکی خراپت ڕەچاو کردوە.

**ئاغا:** من وەکو ئاغا بە مافی خۆمی دەزانم و مافی خۆمە هەر کاتێك پێم خۆش بوو قسەی نۆکەرەکەم ببڕم. نۆکەرەکەشم مافی ئەوەی نییە بێتە ناو قسەی ئاغاکەیەوە.

**ژاک:** گەورەم، ئەمن قسەکانت پێ نابڕم، خەریکی قسەکردنم لەگەڵت، هەر وەک هەمیشە کە داوام لێ دەکەی قسەت لە تەکا بکەم. ئیزنیشم بدە با شتێکیش بڵێم: هیچ خۆشیم لەو هاوڕێیەت نەهات. گرێوت لەگەڵ دەکەم ئەو ژنەی تۆ دەتهەوێ بیکەی بە هاوسەری خۆت خۆشەویستی خۆیەتی.

**ئاغا:** بەسە لێی ببڕەوە! ئیدی یەک قسەش ناکەم؟ (*بە توڕییەوە لە سەر سەکۆ دێتە خوارەوە*).

**ژاک:** نا، گەورەم! تکات لێ دەکەم! درێژەی بدە!

**ئاغا:** جا سوودی چییە؟ ئەتۆ کەسێکی لووتبەرز و بێ زەوقی، هەموو شتێکیش پێشوەختە و لە پێشدا دەزانی.

**ژاک**: گەورەم راست دەکەی، بەڵام فەرموو درێژەی بدە. ئەوەی مەزەندەم کردوە شتێکی ساکار و دیاری چیرۆکەکەیە. ناتوانم بەو قسانەت لەگەڵ سێن-ئۆوێن و ئالۆزی ئەو چیرۆکە هیچ بە بیرمدا نەیەت.

**ئاغا:** تووڕەت کردوم. ئیدی ناتوانم هیچ بڵێم.

**ژاک:** تکات لێ دەکەم.

**ئاغا**: ئەگەر دەتهەوێ ئاشت بینەوە، دەبێ بەسەرهاتی خۆتم بۆ بگێڕیەوە. بەو مەرجەش کە هەر کاتێك پێم خۆش بوو بێمە ناو قسەکانتەوە. دەمهەوێ بزانم چۆن پاکی خۆت لە دەست داوە. ئەوەش بزانە کە ڕەنگە لە نێو گەرمەی بەسەرهاتی یەکەم خۆشەویستیتدا، ڕەنگە چەند جار بێمە ناو قسەکانتەوە.

## دیمەنی سێیەم

**ژاک:** هەر چۆنێك تۆ پێت خۆشە گەورەم، هەر چۆنێکی تۆ پێت باشە، با وابێ. چاو لێ بکە (*ئاوڕ دەداتەوە و هێما بەو پلیکانە دەکا کە ژووستین و بیگری لاو پێیدا سەردەکەون، بیگری پیر لەبەر پلیکانەکاندا راوەستاوە*). ئێرە دووکانێکە کە باوەپیارەم، بیگری پیر، تەگەر و تەوەر و شمەکە دەستکردەکانی خۆی تێدا دەفرۆشت. ئەو پلیکانە دەچێتە ژووری بەر هەیوانەکە، جا قەرەوێڵەکەی بیگری لاویش کە هاوڕێیەکی خۆمە، هەر لەوێیە.

**بیگری پیر:** (*بەرەو ژووری بەر هەیوانەکە هاوار دەکا*) بیگر! کوڕە بیگر. تووتکە سەگ، ئەوە خۆت لە کارێ دەدزییەوە!

**ژاک:** قەرەوێڵەکەی بیگری پیر لە نهۆمی خوارەوەی دووکانەکەدایە. هەموو شەوێك دوای ئەوەی ئەو نوقمی خەوێکی خۆش و قورس دەبێ، بیگری لاو بە ئارامی دەرگا دەکاتەوە و بە هێواشی ژووستین بە پلیکانەکاندا دەباتە لای خۆی.

**بیگری پیر:** ئەوە هەتاو گەیشتە نێوەڕاستی ئاسمانی، کەچی تۆ هێشتا هەر پرخەی خەوت دێ. پێت خۆشە بێمە سەر و بە شەپ وەدەرت نێم.

**ژاک:** ئەو شەوە هێندەیان خۆش رابواردبوو کە بەیانیش هەتا درەنگەوەختان هەر لە خەودا بوون.

**بیگری لاو:** (لە ژووری بەر هەیوانەکەوە) بابە، دە ماڵتە لەسەرەخۆ بە!

**بیگری پیر:** وەرە تەوەری ئەو داشقەیە ببەوە بۆ وەرزێر. خێراکە دەی، پەل بزوێوە!

**بیگری لاو**: ئەوە هاتم! (لەگەڵ ئەوەدا کە قۆپچەی پانتۆڵەکەی دادەخا، بە پلیکانەکاندا دێتە خوارەوە).

**ئاغا:** کەواتە کچەکە هیچ ڕێگایەکی بۆ هەڵاتن نەبوو؟

**ژاک:** نا بە هیچ شێوەیەك، پیس لە داو کەوتبوو.

**ئاغا:** (*لەکاتێکدا پێدەکەنێ*) پێم وابێ وەك دارەبی دەلەرزی.

**بیگری پیر:** لەوەتەی عاشقی ئەو دێڵەسەگە بووی رۆژێ هەتا نیوەڕۆ هەر پرخەی خەوت دێ. ئەو ژنەش، باشە ئەو ژانەسەرە چی بوو تووشی منی کرد. بێ ئەخلاقییە! ئەگەر ئەو دایکە داماوەی ئێوەی پێکەوە دەدی، ئێستا پڕ شەقی دەکردن و چاوی کچەکەشی لەبەر دەرگای کلیسا... هەڵدەکۆڵی! بەڵام، من خەتای خۆمە کە ئاوات لەگەڵ دەجوولێمەوە. دنیا گۆڕاوە، منداڵی ئەم دەوروزەمانە! (*ڕووەو بیگری لاو تەوەرەی چەرخەکەی لە سەر شانی داناوە دەچێتە دەر*).

**ئاغا:** ژوستینیش لە سەرەوە گوێی لە هەموو قسەکان بوو؟

**ژاک:** بەڵێ، سەرلەبەری قسەکان.

**بیگری پیر:** خودا بە نەحلەتی کا، ئەدی کوا سەبیلەکەم؟ هەر ئەو کوڕە سەگە بێ خێرەم هەڵیگرتووە! با بچم بزانم لە ژوورەکەیدا نییە. (*بە پلیکانەکان هەڵدەگەڕێ*).

**ئاغا:** ئەدی ژووستین؟ ژووستین چی بەسەر هات؟

**ژاک:** خۆی خزاندە ژێر قەرەوێڵەکەوە.

**ئاغا:** ئەدی بیگری لاو؟

**ژاک:** هەر کە تەوەرەی داشقەکەی دا بە وەرزێر، بە پەلە خۆی لە ماڵی من هاویشت. پێم گوت "گوێ بگرە، تۆ بچۆ هێندێك بە ناو گووندەکەدا بسووڕێوە. لەو ماوەیەدا، من ڕێگایەك بۆ سەرقاڵکردنی باوکت دەدۆزمەوە و بەم شێوەیە ژووستین دەتوانێ هەڵێ و دەرباز بێ. پەلەم لێ مەکە(*دەچێتە سەر سەکۆکە، ئاغا پێدەکەنێ*) بە چی پێدەکەنی؟

**ئاغا**: ئا، بە هیچ.

**بیگری پیر**: (*کە ئێستا لە ژووری بەر هەیوانەکەوە هاتۆتەوە خوار)* ژاك کوڕە پاکژکراوەکەم! خۆشحاڵم بە دیتنت! چی بووە کە بەم بەیانییە زووە ئەوەندە بە دەماخەوە هاتوویە ئێرە؟

**ژاک:** بەرەو ماڵێ دەچوومەوە، گوتم با سەرێکیش لە تۆ بدەم.

**بیگری پیر:** باشە، باش، ڕۆڵە، ژاك. تۆ خەریکە دەبیە هەرزەیەکی تەواو.

**ژاك:** بڵێم چی؟

**بیگری پیر:** بۆ هەردووکتان بەداخم، هەم بۆ تۆ و هەم بۆ کوڕەکەی خۆم. شەو لە دەرەوە بووی، وایە؟

**ژاك:** چی بکەم؟

**بیگری پیر:** لەگەڵ قەحبەیەکدا؟

**ژاك:** ڕاستە، بەڵام ناوێرم هیچ بە باوکم بڵێم.

**بیگری پیر:** چاك تێگەیشتم. ئەویش هەر ئەو تێهەڵدانە خەستە قەرزداری کوڕەکەیەتی کە منیش قەرزداری کوڕەکەمم. بەڵام تێی هەڵدە، جارێ واز لەوە بێنە، وەرە نانی بەیانی بخۆین. شەڕاب بۆ ئەو وەختانە زۆر باشە.

**ژاك:** بەداخەوە ناتوانم. زۆر ماندووم.

**بیگری پیر:** هەرچی ئاوت هەبووە مژیویەتی، ها؟ هیوادارم ژنەتیوە نرخی ئەو ئاوەی بووبێ. چاو، بە قسەی من دەکەی. کوڕەکەم چۆتە دەرێ. بۆچی ناچیە ژوورەکەی و لە سەر قەرەوێڵەکەی پشوویەک بدەی؟ *(ژاك بە پلیکانەکاندا دەچێتە سەر).*

**ئاغا:** *(بە ژاك دەڵێ)* هەی خائین. بێ ناموس. دەبوو هەر لە سەرەتاوە بمزانیبایە.

**بیگری پیر:** ئای لە دەست منداڵی ئەم دەورانە!... منداڵی خوێری... *(لە ژووری بەر هەیوانەکەوە ئاە و ناڵەیەکی کز دێ)*. کوڕی بێچارە، خەریکە خەو دەبینێ... وادیارە ئەمشەو زۆر ناخۆش بووە بۆی.

**ئاغا:** خەو، هەی هەی! کوڕە خەوی چی و شتی. خەریکە کچە داماوە لاقە دەکا. کچەکە زۆر بە توندی هەوڵ دەدات ڕووبەڕووی بێتەوە و لە خۆی دوور بخاتەوە. بەڵام لە ترسی ئەوەی ئاشکرا نەبێ و نەگیرێ، دەنگی بەرز ناکاتەوە. هەی گرگن و بێ ناموس. تۆ دەبێ بە تاوانی دەستدرێژیکردنە سەر ئەو کچە دادگایی بکرێی.

**ژاك:** *(لە کاتێکدا لە ژووری بەر هەیوانەکەوە چاو لە خوارەوە دەکا)* گەورەم، نازانم دەستدرێژیم کردە سەری یان نا. هەر ئەوەندە دەزانم هەردووکمان خۆشمان ڕابوارد. تەنیا شتێك کە لە منی دەویست ئەوە بوو کە بەڵێنی بدەمێ...

**ئاغا:** چ بەڵێنیەکت دایە، هەی ناپیاوی دڵڕەش؟

**ژاك:** بەڵێنی ئەوە کە قەت لەو بارەوە هیچ بە بیگری لاو نەڵێم.

**ئاغا:** ئەو بەڵێنیەش ڕێی ئەوەی بۆ تۆ خۆش کرد کە بچییەوە پاڵی.

**ژاك:** بەڵێ!

**ئاغا:** چەند جار؟

**ژاك:** زۆرجار، هەموو جارێکیش لە جاری پێشوو خۆشتر بوو.

*(بیگری لاو لە سەر سێن)*

**بیگری پیر:** بۆ هێندەت پێ چوو؟ هانێ ئەم قەراخی تەوەرە بگرە و لە دەرێ کارەکەی تەواو بکە.

**بیگری لاو:** بۆچی لە دەرێ؟

**بیگری پیر:** با ژاك لە خەو هەڵنەسێ.

**بیگری لاو:** ژاک!!!

**بیگری پیر:** بەڵێ، ژاک. لە سەرێ لە ژوورەکەتدا سەرەخەوێك دەشکێنێ. ئەوەش شانس و بەختی باوکی داماو! هەمووتان، خاستان نییە، هیچتان خێرتان نییە. دەی زووکە بۆ وا حەپەساوی؟ بجووڵێ؟ (بیگری لاو بەرەو پلیکانەکان دەچێ و دەیهەوێ بە پلیکانەکاندا سەرکەوێ) دەچیە کوێ؟ لێیگەڕێ با ئەو کوڕە داماوە تاوێک بنوێ!

**بیگری لاو:** (*بە دەنگی بەرز*) بابە! کوڕە بابە!

**بیگری پیر:** زۆر ماندوو بوو!

**بیگری لاو:** با بچمە سەرێ!

**بیگری پیر:** نا، نابێ بچی! پێت خۆشە یەکێک خەوت لێ تێک بدا؟

**ئاغا:** ژووستینیش گوێی لە هەموو ئەو قسانە بوو؟

**ژاک:** (*لەکاتێکدا لە سەر پلیکانەکان دانیشتووە*) وەك چۆن تۆ گوێت لە قسەکانە، ئەویش ئاوا هەموو شتێکی دەبیست.

**ئاغا:** سەیرە! هەی بەدفەڕ! تۆ چیت کرد؟

**ژاک:** پێکەنیم.

**ئاغا:** بۆ ئەوە دەبێ لە سێدارە درێی! ئەدی ژووستین چی کرد؟

**ژاک:** پرچی خۆی دەڕنی، چاوی لە ئاسمان بڕیبوو و بەرە دەستی لێک دەسوون.

**ئاغا:** ژاک، تۆ ئاژەڵی.

**ژاک:** (*لەکاتێکدا بە پلیکانەکاندا دێتەخوار، بە لەبزێکی زۆر جیددییەوە*) نا. گەورەم، نا. من پیاوێکی زۆر هەستیارم. بەڵام هەستیارییەکەم بۆ کاتێکی گونجاو رادەگرم. بۆ ئەو کەسانەی زۆر هەستیارترن و لە کاتی پێویستدا هەستیاربوونی خۆشم دەردەخەم.

**بیگری پیر:** (*بە ژاك*) ئاە، ئەوە هاتی، خەوت لێ کەوت؟ بەڕاستی پێویست بوو. (*ڕوو لە بیگری لاو*) وەکو گوڵ گەشاوەتەوە. بچۆ قاپێك شەڕاب لە ساردەوەکە بێنە،(*ڕوو لە ژاك*) ئێستا ئیدی قاوەڵتوونت پێ دەخورێ. وایە؟

**ژاک:** بەڵێ.

*(بیگری لاو بە قاپێك شەڕابەوە دەگەڕێتەوە و بیگری پیر سێ پێکەکە پڕ دەکا).*

**بیگری لاو:** (*پێکەکەی خۆی دەگێڕێتەوە*) بەم بەیانیە زووە ئیشتیام نایبا.

**بیگری پیر:** ناتهەوێ قومێک بخۆیەوە؟

**بیگری لاو:** نا.

**بیگری پیر:** ئاە. دەزانم چ بووە (*ڕوو لە ژاك*) هەمووی لە ژێر سەری ئەو ژووستینە دایە. ئەوە بۆیە هێندەت پێ چوو لە دەرەوە. بێگومان سەرێکی لە ماڵی ئەو داوە و لەگەڵ کەسێکی دیکەدا گرتوویەتی (*ڕووەو بیگری لاو*) پێم خۆشە هەرچیت بە سەر بێ! پێم گوتبووی ئەو قاحبەیە و تەواو! (*ڕووەو ژاك*) ئێستاش دەیهەوێ تۆڵەی خۆی لەو قاپە شەڕابە بێ تاوانە بکاتەوە!

**ژاک:** وێدەچێ قسەکەی تۆ راست بێ.

**بیگری لاو**: ژاك، گاڵتە مەکە، ئەم باسە بۆ پێکەنین نابێ.

**بیگری پیر**: باشە، ئەگەر ئەو ناخواتەوە، ئێمە خۆ دەتوانین بخۆینەوە. (*پێکەکەی بەرز دەکاتەوە*) ژاك کوڕە خاوێنەکەم، بە خۆشیت!

**ژاك**: (*پێکەکەی بەرز کردۆتەوە*) بە خۆشیتان! (*ڕووەو بیگری لاو*) هاوڕێم، قومێکمان لەگەڵ بخۆوە. ئەو شتەی بۆتە هۆی ناڕاحەتیت شتێکی هێندەش خراپ و تاڵ نییە.

**بیگری لاو**: پێم گوتی، ناخۆمەوە.

**ژاك**: هەتا جارێکی دیکە چاوت پێی دەکەوێ، هەموو مەسەلەکە کۆتایی پێ هاتووە و لە بیریشت چۆتەوە. هیچ هۆیەك نییە بۆ ئەوەی هێندە پێی بشڵەژێی و دڵگران بیت.

**بیگری پیر**: باشە، هیوادارم ژووستین ئەزیەتی بدا... ئێستاش با تۆ ببەمە لای باوکت و تکات بۆ بکەم لەو چوونە دەرەوەیەت خۆش ببێ. منداڵی لاپرەسەن! هەمووتان یەك قوماشن! چاك و خراپتان نییە، هەموو وەک داعبان... پێشم کەوە، با بڕۆین.

*(دەستی ژاك دەگرێ و دەڕوا. بیگری لاو بە پەلە بەرەو پلیکانەکان بۆ لای ژووری بەر هەیوانەکە هەڵدێ. ژاک بە چەند هەنگاوێك لەو دیمەنە دوور دەکەوێتەوە و دەگەڕێتەوە لای ئاغاکەی. بیگری پیر بە تەنیا دەچێتە دەر).*

**ئاغا**: ژاك، بەسەرهاتێکی باشە! فێری ئەوەمان دەکا باشتر ئاگامان لە ژنەکانمان بێ و هاوڕێکانیشمان باش بناسین.

*(سێن-ئۆوێن دێتە سەر سەکۆ، بە ئارامی بە لای ئاغادا دەڕوات).*

**ژاك**: هەر بەڕاستی پێت وابوو هاوڕێکەت هەلی وا لە کیس خۆی دەدا و لەگەڵ خۆشەویستەکەی هاوڕێکەیدا نانوێ؟

## دیمەنی چوارەم

**سێن-ئۆوێن**: دۆستی خۆم! هاوڕێی خۆشەویست! وەرن... *(لە سەر لێواری سەکۆ راوەستاوە، دەستی بۆ لای ئاغا، کە لە خەوارەوەی سێن راوەستاوە درێژ دەکا. ئاغا بە سەکۆکەدا سەردەکەوێ و لەوێوە دەچێتە لای سێن-ئۆوێن. سێن ئۆئێن دەستی دەگرێ و لەگەڵی سەرێ و خوارێ دەکات و*

*دەسووڕێتەوە)* ئای هاوڕێی خۆشەویست. بوونی هاوڕێیەك کە مرۆڤ بەرانبەر بەو هەست بە دۆستایەتی بکات، چەندە خۆشە...

**ئاغا**: سێن-ئۆوێن، تەواو تۆم قەبووڵە.

**سێن-ئۆوێن:** ڕاستت دەوێ، تۆ باشترین هاوڕێی منی، هاوڕێ خۆشەویستەکەم، کەچی من...

**ئاغا:** تۆ هاوڕێی خۆشەویست و گیانی بە گیانی، تۆش باشترین هاوڕێی منی.

**سێن-ئۆوێن:** *(لەکاتێکدا سەر رادەوەشێنێ)* بەداخەوە هاوڕێ، تۆ قەت من ناناسیت.

**ئاغا**: وەك بەری دەستی خۆم دەتناسم.

**سێن-ئۆوێن:** ئەگەر منت ناسیبا قەت ئاوا تامەزرۆی ناسینی من نەدەبووی.

**ئاغا:** باشە چۆن شتی وا دەڵێی؟

**سێن-ئۆوێن:** من مرۆڤێکی سووکم. بەڵێ. قسەی پڕ بە پێستم هەر ئەوەیە و هیچ ڕێگایەکی دیکەشم نییە جگە لە بەکارهێنانی ئەم وشەیە نەبێت سەبارەت بەخۆم، من پیاوێکی سووکم.

**ئاغا:** من ئیزنی ئەوەت پێ نادەم لە لای من بە خراپە باسی خۆت بکەی.

**سێن-ئۆوێن:** من کەسێکی قێزەونم.

**ئاغا:** نا.

**سێن-ئۆوێن:** نەفرەت لێکراوم.

**ئاغا**: *(لە بەردەمیدا چۆك دادەدا)* هاوڕێی خۆشەویست، تاوێك ڕاوەستە. بەم قسانەت دڵبریندار دەبم، بۆچی بەو جۆرە خۆت ئازار دەدەیت؟ باشە بۆچی خۆت سەرکۆنە دەکەی؟

**سێن-ئۆوێن:** رابردووم ڕەشە. وەها شەرمەزارم، بەڵام...

**ئاغا:** چاوت لێیە؟ چ ئازارێکی قووڵ لە شەرمەزاریدایە؟

**سێن-ئۆوێن:** تەنیا شەرمەزارییەك دەتوانێ هەموو ژیان تێک بدا.

**ئاغا:** هێندەی بە دڵ مەگرە، ماچێك بۆ گەورە کچ هیچ نییە.

**سێن-ئۆوێن**: ئاه، نا. هەرچەندە وێدەچێ تەنیا هەر شەرمەزارییەك بێ، بەڵام بێزراو و نەفرەت لێکراوم. من، سێن-ئۆوێن، خیانەتم کردووە، بەڵێ خیانەتم لە هاوڕێیەك کردووە!

**ئاغا:** باشە وەرە بۆم بگێڕەوە؟

**سێن-ئۆوێن:** هەردووکمان شوێن ژنێك کەوتبووین. ئەو عاشقی ژنەکە بوو، ژنەش عاشقی من بوو، لەو کاتەدا کە ئەو پیاوە لەگەڵدا بوو، من دەچوومە پاڵ ژنە. قەت نەمدەوێرا لەلای ئەو پیاوە دان بەمەدا بێنم. بەڵام ئێستا ناچارم. ئەگەر جارێکی دیکە ببینم، دەبێ هەموو رووداوەکەی بۆ بگێڕمەوە، دەبێ دانی پێدا بێنم و خۆشم لە دەست ئەم نهێنییە ترسناکە رزگار بکەم...

**ئاغا:** راستە سێن-ئۆوێن، وا بکە، کاری چاك دەکەی.

**سێن-ئۆوێن:** تۆش پێت وایە ئەو کارە بکەم؟

**ئاغا**: بەڵێ.

**سێن-ئۆوێن:** بە بڕوای تۆ ئەگەر وا بکەم، هاوڕێکەم چیم لێ دەکا؟

**ئاغا:** پاکی و ڕاستگۆیی و پەشیمان بوونەوەی تۆ کاریگەریی لە سەری دادەنێ و لە باوەشت دەگرێ.

**سێن-ئۆوێن:** پێت وایە؟

**ئاغا:** بەڵێ.

**سێن-ئۆوێن:** ئەگەر تۆ بی وا دەکەی؟

**ئاغا:** بەدڵنیاییەوە وا دەکەم!

**سێن-ئۆوێن:** (*باوەش دەکاتەوە*) کەوایە هاوڕێم، باوەشم بکە، لە ئامێزی خۆتم بگرە.

**ئاغا:** مەبەستت چیە؟

**سێن-ئۆوێن:** لە باوەشم گرە! تۆ ئەو هاوڕێ خۆشەویستەی کە خەیانەتم لێ کرد!

**ئاغا:** (*گێژووێژ بووە*) ئاگات؟!

**سێن-ئۆوێن:** بەڵێ، بۆ وا شڵەژای! دەزانی چی، ئەوەی گوتمان هیچی لە بەرچاو ناگرم! وە نازانم هیچم بیستووە، چۆنت پێ باشە وام لەگەڵ بکە! ئەو کارەی من کردوومە بۆ لێ خۆشبوون نابێ. تەریکم بخەوە! بەڕەڵام کە! لێم بێزار بە! ئاخ، خۆزگە دەتزانی من و ئەو ژنە بێ ئەخلاقە چیمان کردوە، خۆزگە دەتزانی چەندە پەشیمانم لەو کارەی کە ناچار بووم بیکەم.

## دیمەنی پێنجەم

*(بیگری لاو و ژووستین لە پلیکانەکان دێنە خوار و لە سەر دواپین پلیکان لە تەنیشت یەکتری دادەنیشن. هەردووکیان گێژووڕ دێنە بەرچاو).*

**ژووستین:** بەڵام سوێندت بۆ دەخۆم، بە گیانی کەسوکارم!

**بیگری لاو**: قەت باوەڕت پێناکەم.

*(دەست دەکات بە گریان)*

**ئاغا:** (*بە سێن-ئۆوێن*) ئەو بێ ئەخلاقە! باشە، تۆ، سێن-ئۆوێن. تۆ چۆن توانیت...

**سێن-ئۆوێن:** دە لەوە زیاتر ئازارم مەدە!

**ژووستین:** سوێندت بۆ دەخۆم قەت هەر دەستیشی لێ نەداوم!

**بیگری لاو**: درۆزن!

**ئاغا:** تۆ چۆن توانیت؟

**بیگری لاو:** ئەویش لەگەڵ ئەو بەرازە؟

*(دەست دەکاتەوە بە گریان)*

**سێن-ئۆوێن:** چۆن توانیم؟ من نەفرەت لێکراوترین پیاوی سەرزەویم! چاولێکە باشترین پیاوی دنیا دۆستی منە و من ئاوا شەرمەزارانە خیانەتم پێکرد. لێم دەپرسی بۆچی؟ چونکە بەرازم! بەراز!

**ژووستین:** ئەو بەراز نییە! ئەو وەك برات وایە!

**بیگری لاو:** *(بە تووڕەییەوە)* برام؟

**ژووستین:** بەڵێ، برا! قەت هەر دەستیشمان لێك نەدراوە!

**بیگری لاو:** بێدەنگ بە!

**سێن-ئۆوێن:** بەڵێ، من بەرازێکم و بەس.

**ئاغا:** نا، تف لە خۆ کردن بەسە!

**سێن-ئۆوێن:** بەڵام من دەبێ تف لە خۆم بکەم.

**ئاغا:** سەرباری ئەوانەش کە روویان داوە، نابێ تف لە خۆت بکەی.

**ژووستین:** بە منی وت ئەو هاوڕێی ڕاستەقینەی تۆیە، قەت، تەنانەت ئەگەر من و تۆ لە دوورگەیەکی چۆڵیشدا بە تەنیا پێکەوە بین، قەت کاری وا لەگەڵ من ناکا.

**ئاغا:** دەست لە ئەشکەنجەدانی خۆتان هەڵگرن.

**بیگری لاو:** بەڕاستیتە، وای گوت؟

**ژووستین:** بەڵێ!

**سێن-ئۆوێن:** دەمەوێ هەست بە ئازار و ژان بکەم.

**ئاغا:** هەردووکمان، من و تۆ بووینە قوربانی کەسێکی ناحاڵی و ئاژەڵسفەت! ئەو هەڵیخەڵەتاندی! ئێوە زۆر پاك و بێگەرد بوون، هیچ شتێکتان لە من نەشاردۆتەوە. ئێوە ئێستاش هەر هاوڕێی منن!

**بیگری لاو:** هەر بەڕاست گوتی "تەنانەت لە دوورگەیەکی چۆڵیشدا؟"

**ژووستین:** بەڵێ!

**سێن-ئۆوێن:** من شایانی هاوڕێیەتی تۆ نیم.

**ئاغا:** بە پێچەوانە. ئەو ژانەی دەیچێژی شیاوتانە. ئەو ژانە لە ئازارێکەوە سەرچاوەی گرتووە کە پێی دەڵێن پەشیمانی!

**بیگری لاو:** هەر بەڕاست گوتی ئەو هاوڕێی منە و تەنانەت ئەگەر لە دوورگەیەکی چۆڵیشدا پێکەوە و بە تەنیا بن، قەت دەستت لێ نادا؟

**سێن-ئۆوێن:** ئای کە تۆ پیاوێکی گەورەی!

**ئاغا:** لە ئامێزم گرە! *(یەکتر لە باوەش دەگرن)*

**بیگری لاو:** هەر بەڕاست ئەو گوتی تەنانەت ئەگەر لە دوورگەیەکی چۆڵیشدا و بە تەنیا بن دەستت لێ نادا؟

**ژووستین:** بەڵێ!

**بیگری لاو:** تەنانەت لە دوورگەیەکی چۆڵیشدا؟ دا سوێند بخۆ!

**ژووستین:** سوێندت بۆ دەخۆم!

**ئاغا:** دە وەرن با شتێك بخۆینەوە!

**ژاك:** ئاە، ئاغا، بۆت بەداخم.

**ئاغا:** بە خۆشی دۆستایەتیمان دەخۆینەوە کە هیچ ژنێکی رەوشت نزم ناتوانێ تێکی بدا!

**بیگری لاو:** لە دوورگەیەکی چۆڵدا. من لەگەڵ ئەودا زۆر بێویژدان بووم. ئەو بەڕاستی دۆستێکی راستەقینەیە!

**ژاك:** ئاغا، سەیر ئەوەیە کە بەسەرهاتەکانمان زۆر لێک دەچن.

**ئاغا:** (*لەکاتێکدا لە رۆڵی خۆی دێتە دەر*) گوتت چی؟

**ژاك:** گوتم بەسەرهاتەکانمان بە شێوەیەکی سەیر هاوشێوەی یەکن.

**بیگری لاو:** ژاك هاوڕێیەکی راستەقینەیە.

**ژووستین:** باشترین هاوڕێی تۆیە.

**سێن-ئۆوێن:** ئێستا تەنیا شتێك کە بیری لێدەکەمەوە تۆڵەیە! چونکە ئەو بێ رەوشتە، خراپەی لەگەڵ هەردووکمان کردووە، دەبێ پێکەوە تۆڵەی لێ بکەینەوە. تۆ تەنیا ئەمرم پێ بکە – پێم بڵێ دەبێ چی بکەم!

**ئاغا:** (*کە زیاتر ئۆگری ژاك و چیرۆکەکەی بووە، بە سێن-ئۆوێن دەڵێ*) زۆر باشە، جارێ لێی گەڕێ، داینێ بۆ دواتر، دوایە کۆتایی بەم حکایەتە دێنین.

**سێن-ئۆوێن:** نا، نا! هەر ئێستا! چیت پێ خۆشە وای لەگەڵ دەکەم! پێم بڵێ چیت پێ خۆشە.

**ئاغا:** باشە، باش، بەڵام بۆ دوایی. ئێستا دەمهەوێ بزانم ژاك چی لێهاتووە (*لە سەر سێن دێتە خوار*).

**بیگری لاو:** ژاك. (*ژاك باز دەداتە سەر سەکۆکە و بەرەو لای بیگری لاو دەچێ*). سوپاست دەکەم. تۆ باشترین هاوڕێی منی. (*لە ئامێزی دەگرێ*) ئێستا ژووستین لە باوەش بگرە. (*ژاك خۆی دەکێشێتەوە دواوە*) شەرم مەکە. کاتێک بۆ خۆم لە لاتان بم، مافی ئەوەت هەیە لە باوەشی بگری. ئەمرت پێدەکەم. (*ژاك ژووستین لە باوەش دەگرێ*). ئێمە دەبینە باشترین هاوڕێی یەکتری، هەرسێکمان، هاوڕێی هەتا هەتایی. لە دوورگەیەکی چۆڵدا. هەر بەڕاستی مەبەستت ئەوەیە کە دەستی لێ نادەی. تەنانەت لە دوورگەیەکی چۆڵیشدا؟

**ژاك:** تێک چووی؟ ئەو ژنی هاوڕێکەمە؟

**بیگری لاو:** تۆ هاوڕێی راستەقینەمی.

**ئاغا:** هەی خوێڕی. (*ژاك بۆ لای ئاغا ئاوڕ دەداتەوە*) بەڵام هێشتا زۆری ماوە چیرۆکەکەی من کۆتایی پێ بێ.

**ژاك:** کەواتە هەر بەو کارە ناحەزەی لە ژوورەکەدا کردتان تێر نەبوون.

**بیگری لاو:** (شاد و سەرخۆش بوو) وەفادارترین ژن. وەفادارترین دۆست. بارتەقای پاشایەك بەختەوەرم.

*(لەناو ئەم دێرانەدا بیگری لاو لەگەڵ ژووستین لە دیمەنەکە دەڕواتە دەر. سێن-ئۆوێن لەناو یەکەمین دێڕەکانی دیمەنی دواتردا دەمێنێ، پاشان ئەویش دەچێتە دەر).*

## دیمەنی شەشەم

**ئاغا:** بەسەرهاتەکەی من زۆر خراپ تەواو بوو. کۆتاییەکی ڕەش، هەروەک چۆن مرۆڤێک دەکرێ تووشی چارەنووسێکی ڕەش بێ.

**ژاک:** خراپترین کۆتایی چیرۆکێك چیە؟

**ئاغا:** باش بیری لێ بکەوە.

**ژاک:** دە لێگەڕێ با بیر بکەمەوە... خراپترین کۆتایی بۆ چیرۆکێك... بەڵام گەورەم، هێشتا چیرۆکی من کۆتایی پێ نەهاتووە، کوڕێتیم لە دەست دا. باشترین هاوڕێم پەیدا کرد. هێندە شاد بووم کە هەڵاتمەدەر و خۆم سەرخۆش کرد. باوکم لێی دام. پۆلێک سەرباز بەوێدا تێدەپەڕین، لەگەڵیان کەوتم، شەڕ دەستی پێکرد، گوللەیەك لە ئەژنۆم درا، لە داشقەیەکیان خستم، داشقەکە لەبەر کۆخێکدا ڕاوەستا، ژنێك لە دەرگای کۆخەکەوە هاتە دەر.

**ئاغا:** پێشتر هەموو ئەوانەت بۆ باس کردوم.

**ژاک:** دیسان قسەکانت پێ بڕیم؟

**ئاغا:** بەردەوام بە، دەی، دەی!

**ژاک:** درێژەی پێنادەم! ئیزن نادەم بەردەوام قسەم پێ ببڕی.

**ئاغا:** (*بە ڕووگرژییەوە*) زۆر باشە. بەڵام بێڵە با درێژە بە ڕێگاکەمان بدەین. هێشتا ڕێگایەکی دوور و درێژمان لەبەرە. ڕاوەستە، هەی بەنەحلەت بی! باشە بۆچی ئەسپمان پێ نییە؟

**ژاک:** گەورەم، لە بیرت چۆتەوە لە سەر سێنی شانۆین. خۆ نابێ لە سەر سێنی شانۆ ئەسپمان پێ بێ!

**ئاغا:** مەبەستت ئەوەیە هەر لەبەر شانۆنامەیەکی قۆڕ، دەبێ ئەو هەموو ڕێگایە بە پێ بڕۆین؟ دەبوو ئەو ئاغایەی ئێمەی داهێنا لە بیری ئەوەشدا بووایە کە ئەسپیشمان پێ بێ!

**ژاک:** ئەوە شتێکی زۆر ناخۆشە کە دەزانین ئێمە لە لایەن کۆمەڵێك ئاغاوە داهێنراوین.

**ئاغا:** دەزانی، زۆرجار لە خۆم دەپرسم تۆ بڵێی ئێمە داهێنانێکی باش بین یا نا. ژاك تۆ دەڵێی چی؟ باشیان داهێناوین؟

**ژاک:** گەورەم بەدەستی کێ؟ ئەو کەسەی لەسەرووی هەموومانە؟

**ئاغا:** لەو سەر سەرەوەیە نووسیبوویان کەسێك لێرە، لەم خوارەوە، بەسەرهاتمان دەنووسێ، ئێستا من بە دەست خۆم نییە، ناتوانم ئەو پرسیارە لە خۆم نەکەم کە هەر بەڕاست ئەو ئاغایەی لەو سەرسەرەیە، کارەکەی خۆی بە باشی بەڕێوە دەبا یان نا؟ کەسێکی بەتوانایە یان نا؟

**ژاک:** ئەگەر بەتوانا نەبووایە نووسەر نەبوو.

**ئاغا:** چی؟

**ژاک:** گوتم ئەگەر بە توانا نەبووایە هیچی نەیدەنووسی.

**ئاغا:** (*لە قاقای پێکەنین دەدا*) ئەوە نیشان دەدا تۆ بەڕاستی نۆکەرێکی کەری. بەڕاستی پێت وایە هەر کەسێك بنووسێ کەسێکی بەتوانایە؟ ئەدی لە سەر ئەو شاعیرە لاوە کە جارێکی هاتبوو، ئەوەی چاوی بە ئاغاکەی هەردووکمان بکەوێ دەڵێی چی؟

**ژاک:** من بۆ دەرمانیش شاعیرێک ناناسم.

**ئاغا:** وادیارە زۆر شت لە سەر ئاغاکەمان نازانی. تۆ لە هەموو نۆکەرەکان خوێندەوارتری (*ژنێک کە خاوە میوانخانەکەیە دێتە ژوورەوە. بەرەو لای ژاك و ئاغاکەی دەچێ و کڕنووشیان بۆ دەبا*).

**خاوەنی میوانخانە:** بەخێربێن، بەڕێزان.

**ئاغا:** خاتوون، بەڕاست، بۆ کوێ بەخێر بێین؟

**خاوەنی میوانخانە:** بۆ میوانخانەی بەرانە کێوی مەزن.

**ئاغا:** پێم وا نییە قەت ئەو ناوەم بیستبێ.

**خاوەنی میوانخانە:** مێزێکم بۆ بێنن! چەند کورسیش! (دوو خزمەتکار بە راکردن بە مێز و کورسیەکانەوە دێنە ژوور و ژاك و ئاغاکەی لەسەریان دادەنیشن). وایان نووسیبوو کە ئێوە لادەدەنە میوانخانەکەی ئێمە و لێرە نان دەخۆن، دەخۆنەوە و دەخەون، گوێ دەدەنە چیرۆکەکانی خاوەن میوانخانەکە کە لە بەر زۆربڵێیی شەویلکەکانی شل بوون.

**ئاغا:** وا دەڵێ زۆربڵێ، وەك ئەوەی نۆکەرەکەی خۆم قەت قسان نەکا!

**خاوەن میوانخانە:** چی دەخۆن، قوربان؟

**ئاغا:** (*لەگەڵ ئەوەی بە چاوێکی پڕ لە تەماحەوە لە خاوەن میوانخانەکە دەڕوانێ*) بۆ ئەوە دەبێ پیاو بڕێك بیری لێ بکاتەوە.

**خاوەن میوانخانە:** زەحمەتی بیرکردنەوە بەخۆت مەدە. وایان نووسیوە ئەوەی ئێوە دەتانەوێ سۆنەی برژاو، پەنیر و قاپێك شەڕابە... (*ژنەکە دەچێتە دەر*).

**ژاك:** گەورەم، دەتویست شتێکم لە سەر شاعیرەکە پێ بڵێی.

**ئاغا:** (*هێشتاش هەر لە ژێر کاریگەری قسە سەرنجراکێشەکانی خاوەن میوانخانەکەدایە*) کامە، شاعیری چی؟

**ژاك:** ئەو شاعیرە لاوەی جارێکیان چاوی بە ئاغاکەمان کەوتبوو...

**ئاغا:** ئەها: بەڵێ. زۆر باشە. رۆژێك شاعیرێکی لاو هاتە سەردانی ئەو ئاغایەی ئێمەی داهێناوە. شاعیران بەردەوام قۆزاخەیان دەدا. هەمیشە پاشکەوتێك بۆ شاعیرانی لاو هەیە. ئەوان رێژەیان لە ساڵدا

نزیکەی چوار سەد هەزار زیاد دەکات، جا ئەوە باشە لە وڵاتی فەڕانسە وایە، ئەگینا لە وڵاتانی دواکەوتوو، وەزعەکە لەوەش خراپترە!

**ژاک:** خەڵك چیان لێ دەکەن؟ دەیانخنکێنن؟

**ئاغا:** پێشتر وایان دەکرد. لە سەردەمی ئیسپارتدا، هەر ئەو کارەی ئەوانیش راست بوو. ئەو سەردەم، هەر لەگەڵ ئەوەی شاعیران لە دایك دەبوون دەمودەست لە گابەردێکی بەرزەوە فڕێیان دەدانە ناو دەریاوە. بەڵام ئێمە لەسەردەمی رۆشنگەریماندا مافی ئەوە دەدەین بە هەموو کەس و جرۆجانەوەرێک کە مافی ژیانی هەبێ و بژی. *(خاوەن میوانخانە قاپێك شەڕاب دێنێ و پیاڵەکانیان پڕ دەکا)*.

**خاوەن میوانخانە:** چۆنە، تامەکەیتان پێ خۆشە؟

**ئاغا:** *(شەڕابەکە دەخواتەوە)* زۆر باشە! ئەگەر عەزییەت نییە، یەکسەر قاپەکە دانێ. (*خاوەن میوانخانە دەچێتە دەر*) ئەها، دەی، رۆژێك شاعیرێك بە لاپەڕەیەکی رێشکەوپێشکەوە لە بەردەمی ئاغاکەمان قووت دەبێتەوە. ئاغاکەمان دەڵێ: "شتێکی سەیرە، هەر بەڕاست ئەوانە شیعرن!" شاعیر وتی: "بەڵێ، ئاغا، خۆم ئەو شێعرانە داناون، داوام ئەوەیە کە قسەی دڵت و هەستی راستەقینەتم لەسەر ئەو شیعرانە پێ بڵێی". ئاغاکەمان گوتی: "تۆ لە راستی ناترسی؟" شاعیر بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وڵامی دایەوە:"نا"، ئاغاکەمان پێی گوت: "بەقوربان، ئەوەی تۆ نیشانی منت داوە بە قەدەر سلپێك گووش بایەخی نیە، لەگەڵ ئەوەشدا نیشانت دا کە هەر سلێک گوو دێنن و بەس".

شاعیری لاو گوتی: "پێم ناخۆشە وا دەڵێی، بەڵام ئەو قسەی تۆ سوورترم دەکا لەسەر ئەوەی لە ماوەی هەموو ژیانماندا، بەس شیعری خراپ بنووسم" ئاغاکەشمان لە وڵامدا گوتی: "ئاخر گێلەپیاو، با شتێکت پێ بڵێم، نە خواکان، نە مرۆڤەکان و تەنانەت کەرەکانیش لە شاعیرە خراپەکان خۆش نابن!" شاعیر گوتی "تێگەیشتم، بەڵام گەورەم، ئەوە لە دەست خۆمدا نییە. چ بکەم، شێعری خراپ بە دەست خۆم نییە، ئەگەر هات، دێ".

**ژاک:** چۆن شتی وا دەبێ؟

**ئاغا:** بۆ نابێ، ناچاری و لە دەست خۆدا نەبوون. ناچارم و بۆ هۆنینەوەی شیعری خراپ تام لێ دێ. "ئاغاکەمان هاواری کرد"ئەوە هەمیسان پێت دەڵێمەوە کە کارەکەت خراپە!" بەڵام شاعیری لاو وڵامی دایەوە "ئەتۆ دیدرۆی مەزنی. من شاعیرێکی خراپم. بەڵام لە رووی ژمارەوە ئێمە، شاعیرە خراپەکان، زۆر لە ئێوە زیاترین، هەتا دێ ئێمە رێژەمان زۆرتر دەبێ و دەبینە زۆرینە! هەموو رەگەزی مرۆڤ لە شاعیرە خراپەکان پێکهاتووە! خەڵکی زەینکوێر، هەستێکی ناسکیان نییە، کەس هەڵنابژێرن، جگە لە کۆمەڵەی شاعیرە خراپەکان؟ بۆ پێت وایە کە شاعیرە خراپەکان شاعیرە خراپەکانی دیکە ئازار دەدەن و دڵیان دەشکێنن. شاعیرە خراپەکان کە پێکهێنەری رەگەزی مرۆیین عاشقی شیعری خراپن! لە راستیدا، من تەنیا لەبەر ئەوە شیعری خراپ دەهۆنمەوە کە رۆژێ لە پەرەستگای شاعیرە گەورەکاندا بم!"

**ژاک:** شاعیرە لاوەکە ئەو قسانەی بە ئاغاکەمان گوت؟

**ئاغا:** رێك ئەم قسانەی پێگوت.

**ژاک:** ئەوەی راستی بێ لە قسەکانیدا نەبوو.

**ئاغا:** هەر وایە. هەر ئەوەش بیرێکی کوفرهێنەر دەخاتە مێشکمەوە.

**ژاک:** دەزانم چ بیرێك.

**ئاغا:** دەزانی؟

**ژاک:** بەڵێ.

**ئاغا:** ئەگەر درۆ ناکەی و دەیزانی دەیڵێی.

**ژاک:** نا، لە پێشدا تۆ بیرت لەوە کردەوە.

**ئاغا:** ئیدی ئەوە بۆ درۆ نابێ، هاوکات بە مێشکی هەردووکماندا هات.

**ژاک:** لە پێشدا بە بیری تۆدا هات.

**ئاغا:** دەی باشە، پێم بڵێ چیت بە مێشکدا هاتووە؟ بیڵێ، دڵم تۆقی.

**ژاک:** ئەتۆ لەپڕ پرسیارت لە خۆت کرد کە بڵێی ئاغاکەی ئێمەش شاعیرێکی خراپ نەبووبێ؟

**ئاغا:** وایە؟ دەتەوێ بڵێی شاعیرێکی خراپ نەبووە؟

**ژاک:** تۆ پێت وایە ئەگەر کەسێکی دیکە ئێمەی داهێنابایە وەزعمان لەوە باشتر دەبوو؟

**ئاغا:** (*تاڕادەیەك بیرمەندانە*) پەیوەندی بە شتێکەوەیە، دیارە ئەگەر بە هۆی پێنووسی نووسەرێکی مەزن و بلیمەتێك داهێنرابایناینە... بێگومان.

**ژاک:** (*پاش بێدەنگییەکی کورتخایەن، بە خەمۆکییەوە*) دەزانی، بە خوا شتێکی ناخۆشە.

**ئاغا:** چی ناخۆشە؟

**ژاک:** ئەوەی کە تۆ بۆچوونێکی هێندە خراپ و سوکت لە سەر داهێنەرەکەت هەیە.

**ئاغا:** (*لەکاتێکدا چاو لە ژاك دەکا*) من لەڕووی کارەکانیەوە دادوەری لە سەر خولقێنەر دەکەم.

**ژاک:** ئێمە دەبێ ئاغاکەی خۆمان هەر چۆنێک بێ خۆش بوێ و رازی بین بە بەشی خۆمان و بە جۆرەی ئێمەی دروست کردوە. ئەگەر خۆشمان بوێ تاڕادەیەك بەختەوەرتر دەبین. تۆ، تۆ داهێنەرێکی باشترت دەوێ. گەورەم، ئەگەر راستت دەوێ من بەوە دەڵێم کفر.

**خاوەن میوانخانە:** (*بە کەشەفێکی پڕ لە چێشتەوە دێتە ژوور*) بەڕێزان، ئەوەش فرووج... هەر کاتێك چێشتەکەتان خوارد و تەواو بوون، منیش چیرۆکی خاتوو دوو لاپوومەریتان بۆ دەگێڕمەوە.

**ژاک:** (*بە زوییرییەوە*) دوای نانخواردن من ئەوەتان بۆ دەگێڕمەوە کە چۆن بوو عاشق بووم!

**خاوەنی میوانخانە:** ئاغاکەت دیاری دەکا کێ لە پێشدا قسە بکا.

**ئاغا:** نا، نا! من خۆمی لێ دەبوێرم! هەموو شتێك پەیوەندی بەوەوەیە لەو بان سەرەوە چی نووسراوە!

**خاوەن میوانخانە:** لە سەرەوەش وا نووسراوە کە بە نۆرەش بێ، نۆرەی منە قسە بکەم.

# پەردەی دووەم

## دیمەنی یەکەم

*(ڕازاندنەوی دیمەنەکە بەبێ گۆڕانکاری و هەر وەک دیمەنەکانی پێشوویە: دیمەنەکە جگە لە مێزی خوارەوە کە ژاك و ئاغاکەی لەو کاتەدا کە خواردنی شێویان لێ خوارد و لە دەوری دانیشتبوون، بە تەواوی چۆڵە).*

**ژاك**: بەسەرهاتی من لەو کاتەوە دەستی پێکرد کە لەو ژنە بوومە پیاو. وەدەرکەوتم، سەرخۆش بووم، باوکم تێڕ و پڕی تێهەڵدام، مەفرەزەیەک چەکدار بەو ناوەدا تێدەپەڕی...

**خاوەن میوانخانە:** *(دێتە ژوور)* ئەرێ خواردنەکە خۆش بوو؟

**ئاغا**: زۆر بەچێژ و تام بوو!

**ژاك:** شتی وا هەر نەبووە!

**خاوەن میوانخانە:** قاپێك شەڕابی دیکەشتان دەوێ؟

**ئاغا**: کاری خێر و پرسیار؟!

**خاوەن میوانخانە:** *(ڕوو لە دەرەوەی دیمەنەکە)* دا قاپێکی دیکە بێنە!... *(بە ژاك و ئاغاکەی)* بەڕێزان بەڵێنم بەو بەڕێزانە داوە مادام کارەکەیان باش راپەڕاندوە، چیرۆکی دوو لاپوومەرییان بۆ بگێڕمەوە...

**ژاك:** دەك ماڵت بە قوورِ گیرێ خاوەن میوانخانە! بە لای ناخێرمەوە خەریکم بەسەرهاتی عاشق بوونی خۆم دەگێڕمەوە!

**خاوەن میوانخانە:** پیاوەکان زوو عاشق دەبن و زووش جیا دەبنەوە. خۆ ئەوە شتێکی نوێ نییە. ئێستا بۆتان دەگێڕمەوە کە چۆن پاداشتی کارە خراپەکانیان وەردەگرن.

**ژاك:** تەکوو زۆری لێ دەرێسی، هەژدە هەزار بەرمیل قسەت لە قوڕگ دایە، هەمیشە لە سەر پێی گوێی داماوێکت دەستکەوێ و قسەکانتی تێدا هەڵڕێژی!

**خاوەنی میوانخانە:** پەکوو ئەتۆش نۆکەرێکی تەواو بێ رەزا و بێ ئەدەبی. ماڵەکتە پێی وایە عاقڵێتی و ئازایەتییە کە بێتە ناو قسەی ژنێکەوە.

**ئاغا:** *(بە شێوازێکی سەرزەنشتکارانەوە)* ژاك، ئیدی قسەکانی پێ مەبڕە، باشە ژاك.

**خاوەن میوانخانە:** زۆر باشە، ڕۆژێك لە ڕۆژان، کابرایەکی مارکسی هەبوو، ناوی دێزارسی بوو. مرۆڤێکی سەیر و سەمەرە و ژنباز بوو، ڕاوچییەکی سەیر و سەمەرەی ژنان بوو. بەگشتی، مرۆڤێکی باش بوو. بەڵام هیچ ڕێز و نرخێکی بۆ ژنان دانەدەنا.

**ژاك:** حەتمەن لە خۆڕا نەبووە.

**خاوەن میوانخانە:** بەڕێز ژاك، بۆ دەپەڕیتە ناو قسەکانمەوە!

**ژاك**: خاتوونی خاوەن میوانخانەی بەرانەکێوی مەزن، لەگەڵ تۆم نییە.

**خاوەن میوانخانە:** قەینا، مارکی بۆنی ژنێکی کرد ناوی مارکیز دوولاپوومەری بوو کە خانەدان و بێوەژنێکی بە ئەدەب، دەوڵەمەند و سەنگین بوو، ژنەکە دوای داواکردنێکردی زۆر لە ئەنجامدا لە بەرانبەر هێزی مارکدا خۆی بەدەستەوەدا و حەزکردنی خۆی پێشکەش کرد. قسە لە کورتی خۆشە، لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا هۆگربوونی بەو پیاوە تووشی کەموکوڕی زۆری کرد. نازانم، خۆ لە مەبەستم تێدەگەن. ها بەڕێزان. سەرەتا پێشنیاری ئەوەی کرد کە کاتێکی زیاتر لەناو کۆمەڵگەدا بەسەر ببا. پاشان گوتی ژنە دەبێ زیاتر میوانداری بۆ بکا. پاش ماوەیەکی کورت خۆی لە بەشداریکردن لە میوانییەکانی دەدزییەوە. هەمیشە کارێکی پێویست و بەپەلەی هەبوو کە دەبوو ئەو کارە ڕاپەڕێنێ. کاتێك دەهاتە سەردانی ژنە، زۆر بە کەمی قسەی دەکرد. لە سەر موبلێك پاڵ دەکەوت. کتێبێکی دەست دەدایە و دواتر کە کتێبەکەی لە لایەک دادەنا دەستی دەکرد بە یاریکردن لەگەڵ سەگی ژنەکە. پاشانیش هەر لەوێ لە لای ئەو خەوی لێ دەکەوت. بەڵام هێشتا خاتوو دوولاپوومەری هەر خۆشی دەویست، زۆریشی ئازار دەچێشت. هەتا ئەو ڕۆژەی کە ژنە لەخۆڕازیەکە سەبری نەما و بڕیایدا کۆتایی بە هەموو شتێك بێنێ.

## دیمەنی دووەم

*(لە نێوان قسەی خاوەن میوانخانەدا، مارکی لە حاڵێکدا کورسییەکی هەڵگرتووە، دەچێتە سەر سەکۆی دیمەنی سەرەوە. کورسییەکە لە سەر زەوی دادەنێ، پاشان تەوەزەلانە و بە کەشێکی تەژی لە بەختەوەری خۆ دەخاتە سەر کورسیەکە).*

**خاوەن میوانخانە:** (*ڕووەو مارکی*) هاوڕێی خۆشەویست.

**دەنگی دەرەوەی دیمەن:** خاتوونی خاوەن میوانخانە!

**خاوەن میوانخانە:** (*بە دەرەوەی دیمەنەکە دەڵێ*) چیە؟

**دەنگی دەرەوەی دیمەن:** کلیلی چایخانەکەم دەوێ!

**خاوەن میوانخانە:** بە قولاپەکەوە هەڵواسراوە... (بە مارکی دەڵێ) خەیاڵ دایگرتووی... *(لە سەکۆکە دەچێتە سەرەوەو بەرەو مارکی دەڕوا).*

**مارکی:** مارکیز، ڕاست وەکو تۆ.

**خاوەن میوانخانە:** ڕاستە، لە خەیاڵێکی تاڕادەیەك تراژیدیدا.

**مارکی:** مارکیز، بۆ وا وەڕەزی، مارکیز؟

**خاوەن میوانخانە:** ئاخ، نا، هیچ نییە.

**مارکی:** *(لەکاتێکدا باوێشك دەدا)* وانییە مارکیز، دا وەرە بۆم بگێڕەوە. هەرچییەک بێ، هەر نەبێ وەڕەزییەکەمانی پێ دەشکێ.

**خاوەن میوانخانە:** کەواتە وەڕەس بویت. وانییە؟

**مارکی:** نا، نا مەسەلەکە تەنیا ئەوەیە هێندێك ڕۆژ هەن... کە...

**خاوەن میوانخانە:** هەردووکمان پێکەوە وەڕس دەبین.

**مارکی:** نا، وانییە، گیانە... بەڵام هێندێك ڕۆژ هەن... کە تەنیا خوا دەزانێ بۆچی...

**خاوەن میوانخانە:** هاوڕێی خۆشەویستم، زۆر لەمێژە دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم، تەنها لەوە دەترسام قسەکانم ناڕاحەتت بکا.

**مارکی:** تۆ من ناڕاحەت بکەی.

**خاوەن میوانخانە:** هەر خودا دەزانێ کە لە هەڵەدا نیم.

**دەنگی دەرەوەی دیمەن:** خاتوونی خاوەن میوانخانە!

**خاوەن میوانخانە:** *(بە دەرەوەی دیمەن دەڵێ)* مەگین پێم نەگوتی ئیدی سەرودڵم مەگرە؟ بچۆ لە مێردەکەم بپرسە؟

**دەنگی دەرەوەی دیمەن:** ئەویش لێرە نییە!

**خاوەن میوانخانە:** دەی باشە، ئەوجار چیت دەوێ؟

**دەنگی دەرەوەی دیمەن:** بازرگانی کا هاتووە.

**خاوەن میوانخانە:** پووڵەکەی بدەیە و وەدەری نێ... *(ڕوو لە مارکی)* بەڵێ مارکی. تەنانەت پێش ئەوەی بە خۆم بزانم ڕوویدا، بۆ خۆشم پێم سەیرە. هەموو شەوێك لە خۆم دەپرسم: "تۆ بڵێی مارکی ئەوینی من ببینێ؟ ئایا هیچ هۆیەکم بۆ سەرکۆنەکردنی هەیە؟ باشە مارکی خیانەتکار بووە؟ نا! لەکاتێکدا ئەو هەروا وەفادار و خۆڕاگر ماوە، کەواتە بۆچی هەستی من گۆڕاوە؟ ئیدی کە وەک جاران وەدرەنگی دەکەوێ نە تووشی دڵەڕاوکێ دەبم و نە قەتیش کە لەپڕ دێ بۆ لام، تووشی هەژان دەبم".

**مارکی:** *(بە ڕووی گەشەوە)* بە ڕاستیتە!

**خاوەن میوانخانە:** *(بە دەستەکانی چاوانی دادەپۆشێ)* ئاخ، مارکی! چاوپۆشی لە سەرکۆنەکردنم بکە... یان، نا چاوپۆشی لێ مەکە... مافی خۆمە... پێت وایە دەبوو هەستی خۆم شاردبایەوە؟ ئەوە منم گۆڕاوم، نەك تۆ. بۆیەش زیاتر لە هەمیشە ڕێزت لێ دەگرم. درۆ لەگەڵ خۆم ناکەم. عەشق لە دڵمدا مردوە. ئەوە شتێکی ترسناکە، ترسناك بەڵام ڕاستە.

**مارکی:** (*بە رووگەشییەوە خۆ دەخاتە سەر لقی*) تۆ، تۆ بوونەوەرێکی جوانی! تۆ جوانترین ژنی سەر زەوی! ئەوەندەت خۆشحاڵت کردم کە دڵپاکیەکەت شەرمەزارم دەکا. تۆ زۆر لە من بەرزتری! من لە هەمبەر تۆدا هیچ نیم! چونکە حەقایەتی دڵی تۆ راست ئەو حەقایەتەیە کە لە دڵی منیشدا بوو، بەڵام نەمدەوێرا بیهێنمە سەر زمان.

**خاوەن میوانخانە:** یانی ئەو شتە راستە؟

**مارکی:** هیچ شتێك ئەوەندەی ئەو قسە راست نییە. ئێستا تەنیا شتێک کە لە دەستمان دێ بیکەین ئەوەیە کە بە هەستی ئەوەوە کە هەمیشە پێکەوە دەبین شادی و گۆڤەند بگێڕین و خۆشحاڵ بین.

**خاوەن میوانخانە:** رێك وایە. چونکە ئەوە بەدبەختیەکی زۆر گەورەیە کە ئەو کەسەی ئێمە خۆشمان دەوێ، ئەو قەت ئێمەی خۆش ناوێ.

**مارکی:** قەت ئەوەندە جوان و شیرینتر لە ئێستا نەهاتوویە بەرچاوم و ئەگەر ژیان کەسێکی خۆپارێزی لە من دروست نەکردبایە، هێندە بەرەوپێش دەچووم کە دەمگوت زیاتر لە هەموو کاتێک خۆشم دەوێی.

**خاوەن میوانخانە:** بەڵام مارکی ئێستا چی، چی بکەین؟

**مارکی:** ئێمە قەت نە فێڵمان لە یەکتر کردووە و نە درۆشمان لەگەڵ یەکتری کردوە. من بەرزترین و زۆرترین رێزت لێ دەنێم. هیوادارم منیش لە لای تۆ تەواو رێزم لە دەست نەدابێ. ئێمە دەبینە باشترین هاورێی یەکتری. لە پەیوەندی ئەویندارى نهێنیماندا یارمەتی یەکتری دەدەین، کێ دەزانێ دنیا چی لێ دێتەوە، رەنگە رۆژێك...

**ژاك:** خۆ خوای گەورە ئاگای لێیە و دەزانێ؟

**مارکی:** رەنگە...(*دەنگی دەرەوەی دیمەن*) ژنەکەم چۆتە کوێ؟

**خاوەن میوانخانە:** (*بەناڕاحەتییەوە، بە دەرەوەی دیمەن دەڵێ*) چیت دەوێ؟

**دەنگی دەرەوەی دیمەن:** هیچ!

**خاوەن میوانخانە:** (*بە ژاك و ئاغاکەی*) بەڕێزان. هەر ئەمە بەسە بۆ شێتکردنی پیاوێک کە دەبینێ ئەم شوێنە چۆڵەوانی و کەلاوەیە ئاوەدان بۆتەوە. دەتزانی ئەو راست ئەو کاتەی هەمووان خەوتووبوون، بانگی دەکردم. هەر لە بیریشم چۆوە باسی چیم دەکرد. دەستەوەستانی ناشیرین... (*لەسەکۆ دێتە خوار*) بەڕێزان بمبوورن، بەڕاستی پیاو بەزەیی بە مندا دێتەوە...

## دیمەنی سێهەم

**ئاغا:** خانم گیان، من بەدڵ پێمخۆشە و حەز دەکەم بەزەییم پێتدا بێتەوە (*دەستی بە پشتیدا دێنێ*) بەڵام دەبێ پیرۆزبایشت پێ بڵێم، چونکە تۆ حەقایەتخوانێکی زۆر باشی. هەر ئێستا شتێکی سەیر بە

مێشکمدا هات. چ دەبوو ئەگەر تۆ لە جیاتی ئەو مێردەت کە ناوت نابوو دەستەوەستان شووت بەم بەڕێز ژاکە کردبایە کە لێرە دانیشتووە؟ پێم خۆش بوو بزانم پیاوێک کە قەت زاری راناوەستێ چلۆن لەگەڵ ژنێکدا هەڵدەکا کە ئەویش دایم بۆڵەبۆڵیەتی؟

**ژاك:** ژاك هەر ئەو کارە دەکا کە کاتێک لەگەڵ داپیرە و باپیرەم دەژیام لەگەڵیان کردووم. ئەوان زۆر تووند بوون لەگەڵ یەکتری. هەڵدەستان لە خەو، جلوبەرگیان لەبەر دەکرد. دەچوونە سەر کار. دواتر شتێکیان دەخوارد و دووبارە دەچوونەوە سەر کار. شەوانە داپیرە دروومانی دەکرد و باپیرە کتێبی پیرۆزی دەخوێندەوە. رۆژانە کەس یەك قسەشی لەگەڵ من نەدەکرد.

**ئاغا:** ئەدی تۆ؟ تۆ چیت دەکرد؟

**ژاك:** لەکاتێکدا دەنگبڕێکیان لە زارم تەپاندبوو لە ژوورەکەدا بەرەو خوار و بەرەوژوور هەڵدەهاتم!

**خاوەن میوانخانە:** دەنگبڕ؟

**ژاك:** باپیرم بێدەنگی و ئارامیی پێ خۆش بوو. هەربۆیە، دوازدە ساڵی سەرەتای تەمەنم بە زار بەستراوی تێپەڕ کرد...

**خاوەن میوانخانە:** (*بە دەرەوەی دیمەن*) هۆی!

**دەنگی دەرەوەی دیمەن:** چیە؟

**خاوەن میوانخانە:** دوو قاپی دیکە! بەڵام نەك لەوانەی بە مشتەرییەکانمانی دەدەین. ئەوانەی لەو پشتەوەن، لە پشت دارەکانەوە!

**دەنگی دەرەوەی دیمەن:** زۆر باشە!

**خاوەن میوانخانە:** مستەر ژاك، بۆچوونی خۆم لە سەر تۆ گۆڕی. تۆ بەڕاستی پیاوێکی داماوی و ئینسان بەزەیی پێتدا دێتەوە. ئێستا تۆ دێنمە پێش چاوم کە بۆ قسەکردن وەخت بووە سوێت بێتەوە. هەستم بۆت جوولا، زۆرم خۆشی لێت دێ. تۆ دەڵێی چی؟ ... وەرە با ئاشت بینەوە.

*(یەکتری لە باوەش دەگرن).*

*(خزمەتکارێك دێتە ژوور و دوو قاپ لە سەر مێزەکە دادەنێ، هەڵیان دەپچڕێ و هەر سێ پیاڵەکە پڕ دەکا).*

**خاوەن میوانخانە:** بەڕێزان! قەت شەڕابی لەوە خۆشترتان نەخواردۆتەوە!

**ژاك:** خاتوونی خاوەن میوانخانە تۆ بێ شك ژنێکی یەکجار جوان بووی!

**ئاغا:** بەخوا کەری، هەر ئێستاش ژنێکی یەکجار جوانە!

**خاوەن میوانخانە:** راست دەکا، وەک ئەو کات نەماوم. بریا ئەو کات کە گەنج بووم منتان دیبا! بەڵام لاوێتی نە لێرەیە و نە لەوێ... با بچینەوە سەر کەر و تێرەکەی خۆمان و باسەکەی خاتوو دوو دوولاپوومەری...

**ژاك:** (*پێکەکەی خۆی بەرز دەکاتەوە*) بەڵام سەرەتا بە خۆشی هەموو ئەو پیاوانە دەخۆینەوە کە بوونە هۆی لەخۆڕازی بوونی تۆ!

**خاوەن میوانخانە:** یەك قسەشم نیە (*پێکەکانیان لە یەکتر دەدەن و دەخۆنەوە*) ئێستاش... فەرموو چیرۆکی خاتوو دوولاپوومەری بگێڕەوە.

**ژاک:** بەڵام ئیزن بدە هەوەڵجار بە خۆشی مستەر مارکی بخۆینەوە. پەرۆشیمە.
**خاوەن میوانخانە:** وێدەچێ پەرۆشیەکەشت بەجێ بێ.
*(پێکەکانیان لە یەکتر دەدەن و دەخۆنەوە).*

## دیمەنی چوارەم

*(لە کاتی دوایین دێرەکانی دیمەنی پێشوودا دایك و کچ هاتوونەتە ژوور و چوونە سەر سەکۆی سەرەوە).*

**خاوەن میوانخانە:** دەتوانن بزانن ئەو ژنە چەندە تووڕەیە؟ بە مارکی بڵێن کە چیتر ئەم ژنە ئەوی خۆش ناوێ و دەبێ لە چاوەڕوانیدا دڵی بتۆقێ! بەڕێزان، ئەم ژنەش حەیا و هەیبەتێکی هەیە بۆ خۆی! *(بۆ لای دایك و کچ دەچێ)* ئەوان بۆ دۆزینەوەی ژیانێکی باشتر ئەم پیاوەیان ناسی. لەمێژ بوو ئەم دوو ژنەی دەناسی. دایك و کچێك. ئەوانیش بە هۆی کێشەیەکی یاساییەوە هاتبوونە پاریس، لە کێشەکەدا دۆڕاندبوویان و ماڵوێران بوون، دایکە بە تەواوی حەیای تکا و کازینۆیەکی بچووکی دانابوو.
**دایك**: *(لە سەر سەکۆوە)* هەژاری و دەستکورتی هیچ یاسایەك ناناسێ. هەموو کارێکم کرد بۆ ئەوەی لە ئۆپێرادا کارێك بۆ کچەکەم بدۆزمەوە. تاوانی من چیە ئەم جاشەکەرە دەنگی هێندە خۆش و دڵگرە؟
**خاوەن میوانخانە:** زۆربەی ئەو پیاوانەی لە کازینۆدا بوون بۆ قومار و نانی شەو دەهاتن، بەڵام جار و بار یەك دوو کەسیان هەر لەوێ دەمانەوە و شەویان لەگەڵ دایك و کچ ڕادەبوارد. ئەوەش دەبووە هۆی ئەوە کە...
**ژاك**: ئەوەش دەبووە هۆی ئەوە کە... بەڵام بە هەر حاڵ ئیزن بدە با بەخۆشی ئەوانیش بخۆینەوە. ئەوانیش ڕێك وەکو قوومە شەڕابێک، سووك و سانا بە قوڕگدا دەچنە خوار.
*(ژاك پێکەکەی خۆی بەرز دەکاتەوە. هەر سێکیان پێکەکانیان لێك دەدەن و دەخۆنەوە).*
**دایك**: *(بە خاوەنی میوانخانە)* خاتوو لامارکیز، بێ پەردە دەڵێم. پیشەی ئێمە پیشەیەکی زۆر ئەستەم و مەترسیدارە.
**خاوەن میوانخانە:** *(دەچێتە سەر سەکۆ و بۆ لای دایك و کچ دەڕوا)* هیوادارم لەو پیشەدا ناوبانگێکی زۆرت وەدەست نەهێنابێ.

**دایك**: بە خۆشیەوە نا. لانیکەم بۆ خۆم وا بیر دەکەمەوە... بنکەکەمان... لە هامبۆرگە... لە دەوروبەری شار...

**خاوەن میوانخانە**: من وای بۆ دەچم کە ئێوە پێتان خۆش نییە درێژە بەم پیشەیە بدەن و لەکاتێکدا من پێم باشە یارمەتیتان بدەم، ئێوە دژایەتی لەگەڵ باشتربوونی بەخت و چارەنووستان ناکەن.

**دایك:** *(بە پێزانینەوە)* ئای، خاتوو لامارکیز گیان!

**خاوەن میوانخانە**: کەواتە دەبێ هەرچیم گوت بە قسەم بکەن.

**دایك:** بە سووکمان مەزانە.

**خاوەن میوانخانە**: زۆر باشە بگەڕێنەوە ماڵەکەتان. هەموو کەلوپەل و تەواوی ئەو جلوبەرگانەشتان کە تەنانەت برێك زریقە و بریقەدارن، بفرۆشن.

**ژاك:** *(پێکەکەی بەرز دەکاتەوە)* بە خۆشی مادموازل! بێگومان هەر ئەو شەوە کە ئاغا گۆڕا، ئەم خاتوونەش ئاوا گۆڕا.

**خاوەن میوانخانە**: **(لە سەر سەکۆوە بە ژاك)** هۆی کاکە، گاڵتەی پێ مەکە! خۆزگە دەتزانی کە دەتوانێ چەندە قێزەون بێت! *(بە دوو ژنەکە)* چەند ژوورێکتان بۆ دەدۆزمەوە و باشترین کەلوپەلی گونجاویشتان بۆ دادەنێم. هەر تەنیا بۆ چوون بۆ کڵێسا لە ژوورەکانتان وەرنە دەر. لە کاتی چوون بەرەو کلیساشدا سەر داخەن و قەت لە خۆتانەوە نابێ بچنە هیچ شوێنێك، دەبێ تەنیا لە سەر خودا قسە بکەن. هەڵبەتە بۆ خۆشم خۆ لە سەردانتان دەبوێرم. من کەسێکی زۆر پاکم... هاموشۆم لەگەڵ ژنە پارێزگارێکی وەك ئێوە پێ باش نییە... ئێستاش هەر ئەو کارەی پێم گوتن بیکەن!

*(دوو ژنەکە دەچنە دەر).*

**ئاغا**: ئەم ژنە دوودڵی کردووم.

**خاوەن میوانخانە:** *(لە سەکۆوە بە ئاغا دەڵێ)* ڕاوەستە با جوان بیناسی.

## دیمەنی پێنجەم

*(مارکی لەو سەری دیمەنەکەوە هاتۆتە ژوورێ. بۆ لای خاوەن میوانخانەکە دەچێ و بە ئارامی پیلی دەگرێ. ژنەکە، بە سەرسوڕماوەی بۆ لای ئەو ئاوڕ دەداتەوە).*

**خاوەن میوانخانە:** ئای، مارکی! زۆر خۆشحاڵم بە دیدارت، چیت پێیە لە سەر بەسەرهاتی ئەوینە شاراوەکانت، خەبەر و باسی ئەو کیژۆڵە خۆشەویستانە چییە؟

(مارکی دەستی دەگرێ و وردە وردە لەگەڵی بەڕێدا دەڕوا. دێتەوە و بە سرتە وڵامی دەداتەوە).

**ئاغا:** چاویان لێ بکە ژاك! ئەو بەرازە، خەریکە هەموو شتێکی بۆ بگێڕێتەوە!

**خاوەن میوانخانە:** هەی بژی! *(مارکی بە سرتە قسەیەکی دیکە بە گوێدا دەچپێنێ)*. تۆ ئێستاش هەر ژنبازی چاکی!

**مارکی:** ماڵت بە قوڕ نەگیرێ، جا خۆ بۆ قسان دانامێنی! *(خاوەن میوانخانە سەری بە نیشانەی نا رادەوەشێنێ)*. ئەو کۆنتە دواکەوتووە. ئەو قووڵەبنەی کە هەمیشە بە دوو قوونتەوە بوو، ئەو چۆنە...؟

**خاوەن میوانخانە:** پێم خۆش نیە قەت ببینمەوە.

**مارکی:** باشە، لەبەر چی وازت لێ هێنا؟

**خاوەن میوانخانە:** خۆشم نەدەویست.

**مارکی:** خۆشت نەدەویست؟ ژیکەڵەترین قووڵەبنە(کورتەڵە)ی دنیات خۆش نەدەویست؟ یان ڕەنگە لەبەر ئەوە بێ کە ئێستاش هەر منت خۆش دەوێ؟

**خاوەن میوانخانە:** ئەگەر وەکو جاران خۆشم بوێی دەڵێی چی...؟

**مارکی:** کەواتە حیساب لە سەر گەڕانەوەم دەکەی و هیواداری بەری هەڵسوکەوتی بە بێ کەم کوڕیت بدوریەوە!

**خاوەن میوانخانە:** لە شتێکی وا دەترسی؟

**مارکی:** تۆ ژنێکی ترسناکی!

*(ئەوان هەروا درێژە بە سووڕانەوە دەدەن، مارکی و خاوەنی میوانخانە دوو ژن دەبینن کە ڕووبەڕوویان دێن، ئەوانە دایك و کچن).*

**خاوەن میوانخانە:** ( *خۆی سەرسوڕماو نیشان دەدا)* خوایە گیان! چۆن شتی وا دەبێ؟ *(دەستی مارکی بەردەدا و بۆ لای دوو ژنەکە دەچێ)*. خاتوونە، ئەوە ئێوەن؟

**دایك:** بەڵێ، بۆ خۆمم.

**خاوەن میوانخانە:** چۆنن؟ ئەو چەند ساڵە چیتان بە سەر هاتووە؟

**دایك:** خۆ تۆ ئاگات لە هەموو کلۆڵی و سەخڵەتییەکانی ژیانی ئێمە هەیە، ژیانێکی ئاسایی و سووچنشینیمان هەیە.

**خاوەن میوانخانە:** کاری باش دەکەن کە خۆتان لە خەڵکی دوور رادەگرن، بەڵام بۆچی خۆ لە من دوور دەخەنەوە؟

**کچ**: خاتوو، زۆرجار لەبارەی تۆوە لەگەڵ دایکم قسەم کردووە، بەڵام ئەو هەمیشە دەڵێ "خاتوو دوو لاپوومەری؟ ڕەنگە ئێمەی لە بیرچووبێتەوە".

**خاوەنی میوانخانە**: ئای لەو بێ ویژدانییە! خۆشحاڵم بەدیتنتان. ئەوەش بەڕێز لویی مارکی دێزارسیە. یەکێکە لە هاوڕێکانم. دەتوانن لە لای ئەویش بە ئازادی قسە بکەن، خۆمانەیە. ماشەڵڵا کچەکە چەندە گەورە بووە!

*(هەر چواریان پێکەوە درێژە بە سووڕانەوە دەدەن).*

**ئاغا**: دەزانی ژاك، ئەم خاوەن میوانخانەیەم کەوتۆتە بەر دڵی. دەزانی چی، خۆ ئەو بۆ ئەوە لە دایک نەبووە هەر لە میوانخانەدا بێ. ئەو شیاوی پلە و ژیانێکی بەرزترە. من هەست بەم جۆرە شتانە دەکەم.

**خاوەن میوانخانە:** بەڕاستی بوویەتە خانمێکی جوان و جحێڵ!

**ئاغا:** هەرچیەکت پێ خۆشە بیڵێ. ئەو ژنێکی رەسەنە.

**مارکی:** *(بە دوو ژنەکە دەڵێ)* تاوێك راوەستن! تکاتان لێدەکەم! مەڕۆن!

**دایك:** *(بە شەرمەوە)* نا، نا. نوێژی شەومان وەدرەنگی دەکەوێت، دەبێ بڕۆین، گیانە.

*(بۆ رێزگرتن کڕنۆش دەبەن و دەچنە دەر).*

**مارکی:** ئەی خوایە گیان، مارکیز! ئەو ژنانە کێن؟

**خاوەن میوانخانە:** بەختەوەرترین بوونەوەرن کە دەیانناسم، هەستت بەوە کرد چەندە هێدی و لەسەرەخۆن؟ ژیان لە کونجی تەنیاییدا گەلێك لایەنی باشی هەیە.

**مارکی:** مارکیز، من دەزانم جوداییمان بۆتە هۆی ئەوە کە تۆ تووشی ئەم توندڕەوییە بەزەییهێنەرە بیت، زۆرم پەژیوان دەکاتەوە.

**خاوەن میوانخانە:** دەتەوێ دووبارە دەرگای دڵم بکەمەوە.

**مارکی:** هیچ قسەی تێدا نییە ئەو کەرەپیاوێکی دواکەوتووە؟

**خاوەن میوانخانە:** تۆ پێت وایە وا بکەم باشە؟

**مارکی:** هەر بیریشی لێ مەکەوە.

**خاوەن میوانخانە:** *(لە سەکۆ دێتەخوار، بە ژاك و ئاغاکەی)* گوێتان لێ بوو؟ *(پێکەکەی لە سەر مێزەکە هەڵدەگرێ و خواردنەوەیەك دەخواتەوە. ئەوجار لە سەر لێواری سەکۆ دادەنیشێ. مارکیش لە تەنیشتی دادەنیشێ)* کە چاوم بەو کچە دەکەوێ زۆر هەست بە پیری دەکەم. یەکەمجار کە بینیم بە زەحمەت باڵای دەگەیشتە نێو قەدم.

**مارکی:** باسی کچی ئەو ژنە دەکەی؟

**خاوەن میوانخانە:** ئەرێ، هەست دەکەم گوڵەبەڕۆژەیەکی سیسەوە بووە لە تەنیشت خونچەیەکدا، بە جوانی سەرنجت دایە؟

**مارکی:** جا ئەوە شتێکی روونە.

**خاوەن میوانخانە:** تۆ خۆت پێت چۆنە؟

**مارکی:** لە مادۆناکانی رافائێل دەچێ.

**خاوەن میوانخانە:** وەی لەو چاوانە!
**مارکی:** ئای لەو دەنگە!
**خاوەنی میوانخانە:** ئۆف لەو پێستە!
**مارکی:** لەو ڕێ ڕۆیشتنە!
**ژاک:** خوایە گیان! مارکی، ئەگەر ئاوا بچیە پێش تێك دەچی!
**خاوەن میوانخانە:** *(بە ژاك)* ڕاست دەکەی، تێك دەچێ.

*(خاوەن میوانخانەکە ڕادەوەستێ، پێکەکەی هەڵدەگرێ. شەڕاب بۆ خۆی تێدەکا).*

**مارکی:** لەو ئەندامە (جەستە)!

*(بەم قسانەوە هەڵدەستێ و دەچێتە دەر، لە کاتێکدا نیمچە بازنەیەك لە سەر سەکۆ دەکێشێتەوە).*

**خاوەن میوانخانە:** *(بە ژاك و ئاغاکەی)* پارووەکەی قووت داوە.
**ژاک:** خاتوونی خاوەن میوانخانە، مارکیزەکەی تۆ دێوزمەیە.
**خاوەن میوانخانە:** ئەدی مارکی؟ نەدەبایە لە ئەوینی ئەو بخافڵێ!
**ژاک:** خاتوون، دیارە چیرۆکی خەنجەر و کێلانت نەبیستووە.
**ئاغا:** منیش نەمبیستووە، قەت بۆت نەگێڕاومەتەوە!

## دیمەنی شەشەم

*(لە دیمەنی خوارەوە، مارکی لە ڕەوتی بازنەیەکدا بەرەو لای خاوەن میوانخانە دەڕوا و بە لالانەوە و پارانەوە لەگەڵ ئەو دەست دەکا بە قسەکردن).*

**مارکی:** مارکیز، قەت بەم دواییانە هاوڕێکانی خۆت دیوە؟
**خاوەن میوانخانە:** *(بە ژاك و ئاغاکەی)* چاوتان لێیە؟ چۆن تووش بووە.
**مارکی:** کارێکی باش ناکەی، ئەوان زۆر داماون و تۆ قەت بۆ شێو بانگهێشتیان ناکەی.

**خاوەن میوانخانە:** ئاه، بانگهێشتیان دەکەم. بەڵام بێ سوودە. هیچیش سەیر نییە. ئەگەر وا بڵاوبێتەوە کە ئەوان چاویان بە من کەوتووە، خەڵك دەڵێن خاتوو دوولاپوومەری پشتیوانیانە و لەو خێرەش بێبەری دەبن کە وەری دەگرن.

**مارکی:** چی؟ ئەوان بە خێر و سەدەقە دەژین؟

**خاوەن میوانخانە:** بەڵێ، بە خێراتی خەڵکی گەڕەکەکەیان.

**مارکی:** ئەوانە هاوڕێی تۆن، کەچی بە خێرات دەژین؟

**خاوەن میوانخانە:** ئاه، مارکی ئێمەومانان کە بەناو کۆمەڵدا دێین و دەچین ناتوانین لە هەستیاریی ئەم جۆرە مرۆڤە لە خواترسانە تێبگەین. ئەوان هیچ جۆرە یارمەتییەك وەرناگرن. دەبێ سەرچاوەی یارمەتییەکان دەستی پاک و بێخەوش بن.

**مارکی:** دەزانی دوودڵ بووم لەوەی کە بچمە سەردانیان؟

**خاوەن میوانخانە:** سەردانەکەی تۆ ڕەنگە ببێتە هۆی لەنێوچوونیان، کچەتیوە هێندە جوانە خەڵك دەست بەجێ قسان هەڵدەبەستن و بەر بە زاری خەڵکیش ناگیرێ!

**مارکی:** *(بە ئاهەوە)* چەندە زاڵمانە...

**خاوەن میوانخانە:** *(بە دڵێکی پڕ لە ئیرەیییەوە)* قسەی پڕ بە پێستیش هەر ئەوەیە کە زاڵمانەیە.

**مارکی:** مارکیز، گاڵتەم پێدەکەی.

*(مارکی،ماندوو بووە لەو هەڵسووڕان بە دەوری ئەو بازنەیەدا، لە دیمەنەکە دەچێتە دەرێ).*

**ژاک:** ئەم ژنە. ئەم مارکیزەی تۆ چەندە قین لە دڵە.

**خاوەن میوانخانە:** *(بە ژاك)* مستەر ژاك، هەوڵ مەدە پشتیوانی لە ڕەگەزی خۆت بکەی. کوێرا لە بیرت چۆوە خاتوو دوولاپوومەری چەندە مارکی خۆش دەویست؟ تەنانەت ئێستاش هەر لە ژێر کاریگەری ئەودایە. هەموو قسەیەکی مارکی وەکو سووژنێك وایە کە لە دڵی ڕۆ دەچێ! ئاگات لەو جەهەننەمە نییە کە هەردووکیان ڕووبەڕووی دەبنەوە؟

*(مارکی لە ڕەوتی نیمچە بازنەیەکدا دەگەڕێتەوە بۆ لای خاوەن میوانخانە، ژنەکە چاوی لێ دەکا).*

**خاوەن میوانخانە:** ئەی خوای بان سەر! تۆ سەیری ئەو چڕ و چاوانە بکە، عەیب و شوورەیی!

**مارکی:** *(لە کاتێکدا کە لە سەر سەکۆ بەرەو سەرو بەرەو خوار دەچێ)* ناتوانم تەحەمولی ئەم دۆخە بکەم، ناتوانم بخەوم. ناتوانم هیچ بخۆم. چەند حەوتوو لەسەریەک هەتا قورقوڕۆچکەم عارەقم خواردەوە و سەرخۆش بووم. پاشان وەك قەشەیەك بوومە کەسێکی خواناس بۆ تاقە جارێک دیتنی ئەو، وتم هەر نەبێ، با کە هات بۆ کلیسا ببینم... مارکیز! ڕێگایەك بدۆزەوە بۆ ئەوەی دووبارە ببینم! *(خاوەن میوانخانە ئاهێك هەڵدەکێشێ)*. تۆ تەنیا هاوڕێی ڕاستەقینەمی!

**خاوەن میوانخانە:** مارکی، زۆر خۆشحاڵ دەبم کە یارمەتیت بدەم، بەڵام هەستێکی ئاڵۆز و هەستیاری هەیە. ئەو قەت نابێ بزانێ من یارمەتی تۆم داوە یان من هاوکاری تۆم کردوە.

**مارکی:** خۆم لە ماڵت هاویشتووە و لێت دەپاڕێمەوە!

**خاوەن میوانخانە:** *(لاسایی دەکاتەوە)* خۆم لە ماڵت هاویشتووە و لێت دەپاڕێمەوە! بە من چی تۆ عاشقی یان نا! سەرم نایەشێ بۆ پرێچکەی لێ بەستم؟ بڕۆ بۆ خۆت سازی بکە و جێبەجێی بکە. کێشەی خۆتان و خۆتان چارەسەری بکەن!

**مارکی:** لێت دەپاڕێمەوە! ئەگەر ئاوا وازم لێ بینی و ئاوڕم لێ نەدەیەوە، دەمرم. ئەگەر لەبەر منیش ئەو کارەی ناکەی لەبەر ئەوان بیکە! ئەوەش بزانە کە من بەڕاستی عاشقە سووتاو و شێت و شەیدای بووم! دەرگای ماڵەکەیان لە گرێژنەوە دەردێنم، هیچ شتێك ناتوانێ بەرم بگرێ!

**خاوەن میوانخانە:** با واش بێ... کەیفی خۆتە، چیت پێ خۆشە بیکە... لانیکەم مۆڵەتم بدەیە خۆمی بۆ ئامادە بکەم...

*( هەر لە هەمان کاتدا مارکیز دەچێتە دەر، خزمەتکارەکان کورسیەکان لە دەوری مێزی سەرسەکۆکە دادەنێن).*

## دیمەنی حەوتەم

**خاوەن میوانخانە:** *(بە دایك و کچ کە دەچنە سەر دیمەنی سەرەوە)* فەرموون، فەرموون. لە تەنیشت من لە سەر کورسی دانیشن و دوایە دەست پێ دەکەین، *(ئەوان لە سەر کورسییەکانیان کە لە دەوری مێزی دیمەنی سەرەوە دانراون دادەنیشن. ئێستا دوو مێز لە سەر دیمەنەکەیە: یەکەمیان لەبەر سەکۆ و لە دیمەنی خوارەوەدایە کە ژاك و ئاغاکەی لەسەری دانیشتوون، مێزێکی دیکەش لە سەر سەکۆی دیمەنی سەرەوەیە).* هەر کە مارکی هاتەژوور، هەموومان رواڵەتی سەرسوڕماوی بەخۆمانەوە دەگرین. لە بیرتتان نەچێ بەر بە خۆتان بگرن و هیچ خۆتان مەگۆڕن.

**خاوەن میوانخانە:** *(بە ژاك دەڵێ کە لە دیمەنی خوارەوەیە)* مستەر ژاك، ئایا مارکی فریشتەیە؟

**ژاك:** هیچ کەس داوای لێ نەکردووە فریشتە بێ. پێشت وایە مرۆڤ هیچ رێگایەکی دیکەی نییە جگە لە بوون بە دێو و درنج یان فریشتە؟ ئەگەر چیرۆکی شیر و کێلانت زانیبا زیاتر عەقڵت بە دنیا دەشکا.

**مارکی:** *(بەسەر سوڕمانێکی درۆینەوە دەچێتە لای ژنەکان)* ئای... هیوادارم سەر و دڵتانم نەگرتبێ...

**خاوەن میوانخانە:** (ئەویش سەرسوڕماوە) راستیەکەت دەوێ... هەر بیریشمان لەوە نەدەکردەوە چاومان بە تۆ بکەوێ، بەڕێز لو-مارکی...

**ئاغا:** ئەو ئەکتەرە سەیرانە!

**خاوەن میوانخانە:** بەڵام مادام هەر هاتووی، تکات لێدەکەم نانی شێویشمان لەگەڵ بخۆ.

*(مارکی دەستی خانمەکان ماچ دەکا و لە سەر کورسی دادەنیشێ).*

**ژاك:** وا دیارە بەسەرهاتێکی قۆڕ و جاڕزکەرە. ئیزن بدەن با چیرۆکی شیر و کێلانتان بۆ بگێڕمەوە.

**مارکی:** (*دەچێتە ناو باسی خانمەکانەوە*) تەواو لەگەڵ قسەکانتانم. تامەکانی ژیان چین؟ خاك و خۆڵەمێش. دەتوانن مەزەندەی ئەوە بکەن من کێم لە هەموو کەس پێ باشترە؟

**ژاك:** گەورەم، گوێ مەدەیە قسەکانی.

**مارکی:** ناتوانن مەزەندەی بکەن، مەگەر نا، "ساینت سیمۆنی پیرۆز"ی کۆڵەکەنشین. ئەو پێشەوای پیرۆز و پشتیوانی منە.

**ژاك:** بۆ ئەوەی پیاو عاقڵ بێ، دەبێ چیرۆکی شیر (شمشێر) و کێلان کە وانەیەکی ئەخلاقیە ببیستێ.

**مارکی:** خانمە خۆشەویستەکان، بیری لێ بکەنەوە! ساینت سیمۆنی پیرۆز چل ساڵ لە تەمەنی خۆی لە سەر کۆڵەکەیەك کە چل میتر لە زەوی بەرزتر بوو، بۆ پەرستنی خوا تەرخان کرد.

**ژاك:** گوێی خۆ بدەنە من. هەبوو نەبوو، شمشێر و کێلانێک هەبوون، لێیان بوو بە شەڕ، شمشێر گوتی: "کێلانی ئازیز، خۆزگە تۆ ژنێکی هیچ و پووچ نەدەبووی و هەر رۆژەی شیرێکی تازەت لە خۆت رۆ نەدەکرد" کێلانیش لە وڵامدا گوتی: "شیرە خۆشەویستەکەم، خۆزگە تۆش هێندە هەوەسباز نەدەبووی و هەموو رۆژێ خۆت بە کێلانێکیتردا نەدەکرد".

**مارکی**: خانمە بەڕێزەکان، بیری لێ بکەنەوە، چل ساڵ لە تەمەنی خۆی لە سەر کۆڵەکەیەك تێپەڕ کرد کە چل میتر لە زەوی بەرز بوو.

**ژاك:** خەریکی خواردنی نانی شێو بوون کە شەڕ دەستی پێکرد. یەکێك لە میوانەکان کە لە نێوانیان دانیشتبوو ناڕەزایەتی خۆی دەربڕی و گوتی: کێلانی خۆشەویست شیری ئازیز، ئێوە بە شیر گۆڕین و بە کێلان گۆڕین تووشی هیچ هەڵەیەك نەبوون و هیچی خراپتان نەکردوە، لەڕاستیدا، ئێوە ئەو رۆژەی کە بەڵێنی نەگۆڕینتان داوە تووشی هەڵەیەکی گەورە و کارەساتبار بوون. شیری خۆشەویست مەگین ئێستاش لەوە تێنەگەیشتووی خوا جۆرێکی دروستکردوی کە بتوانی لە زۆر کێلانی دیکەدا جێگەت بێتەوە؟

**کچ**: پێم بڵێ بەڕاستی ئەو کۆڵەکە چل میتر بەرز بوو؟

**ژاك:** ئەدی تۆ کێلانی هاوڕێ، باشە تۆش ناتوانی لەوە تێ بگەی کە خوا تۆشی جۆرێك دروست کردوە کە بتوانی گەلێك شیر (خەنجەر)ی دیکەش لەخۆت خەی؟

*(ئاغا بێ ئەوەی سەرنج بداتە دیمەنەکە گوێیی لە قسەکانی ژاك راگرتووە. پاش ئەم قسانە، پێدەکەنێ).*

**ماركی:** (*بە دلۆڤانی ئەویندارێکەوە روو لە کچ*) بەڵێ، بەرخەگیان چل مەتر بەرز بوو.

**کچ:** ساینت سایمۆنی پیرۆز تووشی سەرگێژە نەدەبوو؟

**ماركی:** نا، تووش نەدەبوو. دەزانی هۆکەی چی بوو. گوڵم؟

**کچ:** نا.

**ماركی:** هۆیەکەی ئەوە بوو ئەو تەنانەت بۆ جارێکیش لە لوتکەی کۆڵەکەوە سەیری خوارەوەی نەکرد. هەمیشە چاوی لە ئاسمان بوو، چاوی لە خوا بوو. ئەو کەسەش کە سەیری ئاسمان بکا قەت گێژ نابێ.

**خانمەکان:** *(بە سەرسوڕمانەوە)* زۆر راستە!

**ئاغا:** ژاك!

**ژاك:** بەڵێ.

**ماركی:** *(لەکاتێکدا ئێزن لە خانمەکان دەخوازێ)* دیداری ئێوە شانازییەکی مەزن بوو...

*(لە سێن دەچێتە دەر).*

**ئاغا:** *(لە کاتێکدا پێدەکەنێ)* ژاك، چیرۆکەکەی تۆ چیرۆکێکی بێ ئەخلاقانە بوو. هەربۆیە پەسەندی ناکەم، بە چیرۆکێکی هیچ و پووچی دادەنێم.

**ژاك:** بەڵام خۆ تۆ پێت خۆش بوو!

**ئاغا:** ئەوە پەیوەندی بە باسەکەوە نییە. کێ هەیە چیرۆکی وای پێ خۆش نەبێ؟ ئەوە شتێکی روون و حاشاهەڵنەگرە کە پێم خۆش بوو!

*(خزمەتکارەکان مێز و کورسییەکان دەبەنە سەر سێنی سەرەوە. ژاك و ئاغاکەی دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی سەیری سەکۆ بکەن. مارکی دەچێتە لای خاوەن میوانخانە).*

## دیمەنی هەشتەم

**خاوەن میوانخانە:** مارکی دا پێم بڵێ بزانم: لە سەرتاسەری فەڕانسەدا ژنێکی وا هەیە کە ئەو کارەی ئێستا من بۆ تۆی دەکەم ئەویش بۆ تۆی بکا؟

**مارکی:** *(لە بەرامبەریدا چۆك دادەدا)* تۆ تەنیا هاوڕێی راستەقینەمی...

**خاوەن میوانخانە:** وەرە با باسەکە بگۆڕین، بوخچەی دڵت بکەوە، با بزانم دڵت چی تێدایە.؟ دڵت چیت پێ دەڵێ؟

**مارکی:** یان دەبێ ئەو کچە هی من بێ یان دەمرم.

**خاوەن میوانخانە:** زۆرم پێخۆشە گیانت رزگار بکەم.

**مارکی:** دەزانم دڵگرانت دەکەم، بەڵام دەبێ دان بە شتێکدا بنێم: نامەیەکم بۆ ناردوون، هەروەها سندوقێکی زێڕینی پڕ لە زێڕ، بەڵام ئەوان هەردووکیان بۆ ناردمەوە.

**خاوەن میوانخانە:** *(نێوچاوانی تێك ناوە)* مارکین هێزی ئەوین و خۆشەویستی خەریکە گەندەڵت دەکا. ئەو دوو ژنە داماوە چیان لەگەڵ تۆ کردووە کە تۆ هێندە سووری بۆ ناوزڕاندنیان؟ بەڕاستی پێت وایە بە مستێك زێڕ و زیو دەتوانی "پاکی" بکڕی؟

**مارکی:** *(لەکاتێکدا هێشتاش هەر لە کڕنۆش دایە)* لێم ببوورە.

**خاوەن میوانخانە:** من جارێکی دیکەش وریام کردیەوە. بەڵام تۆ حەیات نیە، تەمبێ نابی.

**مارکی:** هاوڕێی خۆشەویست. دەمەوێت دوایین هەوڵی خۆم بدەم. بە تەمام یەکێک لە ماڵەکانی ناو شارم و یەکێکی دیکە کە لەوانی قەراخی شاریشیان بدەمێ و بە ناوی ئەوانەوە تاپۆیان بکەم. هەرچی هەمە، نیوە بە نیوە لەگەڵیان بەش دەکەم.

**خاوەن میوانخانە:** کەیفی خۆتە، چۆنت باشە وا بکە... بەڵام شەرەف نرخێکی دیاریکراوی بۆ دانانرێت. من ئەم ژنانە دەناسم.

*(ژنەکە لە مارکی دوور دەکەوێتەوە، هەروا کە ئەو لە کڕنۆشدایە بەجێی دێڵێ، دەچێ بۆ لای دایك، کە لەوسەری دیمەنەکەوە دێتە لای و کڕنۆشی بۆ دەبا).*

**دایك:** خاتوو مارکیزە، داوات لێدەکەم رێگریمان لێ مەکە لە وەرگرتنی دیاریەکە! سامانێکی هێندە زۆر! مڵکێکی هێندە گەورە! شانازییەکی هێندە گەورە!

**خاوەن میوانخانە:** *(بە دایك کە هێشتا هەر لە کڕنۆشدایە).* پێت وایە ئەوەی کردوومە لەبەر بەختەوەریتان بووە؟ دەبێ بڕۆی دیاریەکەی مارکی یەکجێ رەت بکەیتەوە و وەرینەگری.

**ژاك:** ئێستا ئەو ژنە لە چی دەگەڕێ؟

**خاوەن میوانخانە:** *(بە ژاك)* مەبەستەکەی هەر چیەك بێ لە بەرژەوەندی ئەو دو ژنەدا نییە. ئەو هیچ نرخێک بۆ ئەوان دانانێ، مستەر ژاك! *(بە دایك)* یان ئەو کارەی کە دەڵێم بیکەن یان هەر ئێستا راست دەتانبەمەوە بۆ قەحبەخانەکەتان.

*(ڕووی لێ وەردەگێڕێ و دەگەڕێتەوە لای مارکی کە هەر لە کرنۆشدایە. دایك بە هێمنی هەڵدەستێ و لە بەرچاوی بینەراندا ون دەبێ).*

**مارکی:** هاوڕێی خۆشەویست، قسەکەی تۆ زۆر راستە. ئەوان دیاریەکەی منیان رەت کردەوە. ئیدی بیرم بۆ هیچ شتێکی دیکە ناچێ. ئێستا دەبێ چی بکەم؟ ئاخ، مارکیزە، دەزانی چ بڕیاریکم داوە؟ بڕیارم داوە ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێك بێنم.

**خاوەن میوانخانە:** *(بەسەرسوڕمانێکی دەسکردەوە)* مارکی، ئەوە بڕیارێکی گرنگە و پێویستی بە بیرکردنەوەیەکی زۆرە.

**مارکی:** مارکیز، بۆچی؟ خۆ لەوە کڵۆڵتر نابم کە ئێستا هەم.

**خاوەن میوانخانە:** مارکی، پەلە مەکە. بڕیارێکی بەپەلە دەتوانێ هەموو ژیانت بەفیڕۆ بدات... *(ڕواڵەتی بیرکردنەوە بە خۆوە دەگرێ)*. هەرچەندە بەڕاستی ئەم ژنانە خۆپاریزن کەچی دڵیان وەکو ئاوێنە روون و بێگەردە... رەنگە قسەکەی تۆش راست بێ. هەژاری خۆ تاوان نییە.

**مارکی:** داوات لێ دەکەم بچیە لایان و بڕیار و نییەتی منیان پێ رابگەیەنی.

*(خاوەن میوانخانە دەگەڕێتەوە بۆ لای مارکی و دەستی لەگەڵ لێ دەداتەوە، هەردووکیان لە ڕووبەڕووی یەکتردا رادەوەستن. مارکی پێدەکەنێ).*

**خاوەن میوانخانە:** زۆر باشە، بەڵێنت پێ دەدەم ئەو کارە بکەم.

**مارکی:** سوپاست دەکەم.

**خاوەن میوانخانە:** تا ئێستا قەت بووە داوای شتێکت لێ کردبم و بۆم جێبەجێ نەکردی؟

**مارکی:** *(لەناو هروژمی شادی و سەرخۆشیدا)* ئەدی بۆچی وەکو تەنیا دۆست و هاوڕێی راستەقینەم بە قسەم ناکەی و مێرد ناکەی؟

**خاوەن میوانخانە:** مارکی، کەست بۆ دۆزیوەمەوە؟

**مارکی:** بەڵێ، کۆنتەچکۆل.

**خاوەن میوانخانە:** ئەو قووڵە فیتنە لادێییە؟

**مارکی:** دەوڵەمەندە، زیرەك و وریاشە ...

**خاوەن میوانخانە:** باشە کێ دەتوانێ گەرەنتی وەفاداری ئەو بکا؟ رەنگە بڵێی، هەر بۆ خۆم؟

**مارکی:** تۆ دەتوانی زۆر بە هاسانی لەگەڵ پیاوێکی بێوەفاشدا هەڵکەی و بژی.

**خاوەن میوانخانە:** نا، نا، نا. وا مەڵێ، من ئەوەم پێم ناخۆشە و کەسێکی تۆڵەستێنیشم.

**ماركی:** مادام كەسێكی تۆڵەستێنی، كەوابوو پێكەوە تۆڵەی لێ دەكەینەوە. ئەدی، شتێكی خراپ نییە! دەزانی ماڵێك لە شاردا بە كرێ دەگرین و كۆمەڵێكی چوار كەسی بەختەوەر پێك دێنین.

**خاوەنی میوانخانە:** بەڵێ، بیرێكی خراپ نییە.

**ماركی:** ئەگەر مێردە قوولەكەت توڕەی كردی، دەیخەینە ناو ئینجانەی مێزی تەنیشت قەرەوێڵەكەت.

**خاوەن میوانخانە:** پێشنیارەكەت زۆر سەرنج ڕاكێشە. بەڵام من شوو ناكەم. تەنیا پیاوێك كە بەڕاستی دەیتوانی ببێتە مێردی من...

**ماركی:** ماركی دێزارسیە؟

**خاوەن میوانخانە:** ئێستا ئیدی دەتوانم بەبێ ترس لە لای تۆ دان بەو شتەدا بێنم.

**ماركی:** ئەدی بۆچی زووتر باست نەدەكرد؟

**خاوەن میوانخانە:** وا دیارە حەق بە من بووە كە پێشتر پێم نەگوتووی. ئەو ژنەی هەڵتبژاردوە زۆر لە من زیاتر شیاوی تۆیە.

*(كچەكە بە جلوبەرگی سپی بووكێنی دێتە سەر دیمەنی سەرەوە و بە هێوری دێتە پێش. ماركی چاوی پێی دەكەوێ و دەڵێی لە خەیاڵدا دەژی و بۆ لای دەچێ).*

**ماركی:** ماركیز، هەتا ماوم نۆكەریت دەكەم... *(هەركە دەگاتە لای كچەكە. بۆ ماوەیەكی درێژ یەكتر لە ئامێز دەگرن).*

## دیمەنی نۆیەم

*(لەو كاتەدا كە ماركی و كچە یەكتریان لە باوەش گرتووە. خاوەنی میوانخانە بێ ئەوەی چاو لە ماركی هەڵگرێ، پاشەوپاش دەچێتە كۆتایی دیمەنەكەی دیكە. دواجار بانگی دەكا).*

**خاوەن میوانخانە:** ماركی! *(ماركی ناتوانێ هیچ دژكردەوەیەك لە خۆی نیشان بدات. ئەو بە كردەوە نوقمی لە باوەش گرتنەكە بووە).* ماركی! *(ماركی هێندێك سەری وەرسوڕاند)* ڕازی بووی لە شەوی زەماوەندەكەت؟

**ژاک:** ئەی خوایە گیان، هەر مەپرسە! زۆر زۆر!

**خاوەن میوانخانە**: زۆرم پێ خۆشە. ئێستا باش گوێ بگرە. سەردەمێك ژنێکی بەڕێزت هەبوو. بەڵام نەتتوانی دڵی رابگری. ئەو ژنە من بووم *(ژاك لە قاقای پێکەنین دەدا)*. من بەو جۆرەی خۆت حەز دەکرد کە ژنێکی وەهات هەبێ، ئەو جۆرە ژنەم بۆ هێنای کە شیاوی خۆتە. ئاوا تۆڵەی خۆم لێ کردییەوە. سەرێك لە رودوهامبۆرگ بدە، بۆ ئەوەی بۆت دەرکەوێ خێزانت لە چ رێگایەکەوە بژێوی خۆی دەست دەخست! ژنەکەشت و خەسوەکەشت. *(ناپاکانە پێدەکەنێ)*.

*(کچەکە خۆ دەخاتە سەر لاقی مارکی)*.

**مارکی:** تۆ ژنێکی پەست و سووکی، تۆ!

**کچ:** *(لە کاتێکدا لە سەر لاقی مارکییە)* وەبەر شەپانم دە. مسیۆ، پان و پلیچم کەوە!...

**مارکی:** بچۆ دەرێ. هەی سووکی پیس!...

**کچ:** هەرچی پێت خۆشە لەگەڵم بکە!...

**خاوەن میوانخانە**: مارکی پەل ببزێوە! دەی خێرا بچۆ بۆ رووودوهامبۆرگ! کاتێك گەیشتیە ئەوێ پلاکاردێک هەڵواسە کە لە سەری نووسرابێ: "مارکیزە – دێزارسی لێرە دەخەوت – لەگەڵ کەسێك و لەگەڵ هەمووان" *(جارێکی دیکە بە شەیتانییەوە پێدەکەنێتەوە)*.

**کچ:** *(لەکاتێکدا لە سەر لاقی مارکییە)* بەزەییت پێمدا بێتەوە، بەڕێز!...

*(لەکاتێکدا مارکی بە شەپ کچە لە خۆی دوور دەخاتەوە. کچە توند باوەش بە لاقەکانیدا دەکا، بەڵام پیاوەکە بەجێی دێڵێ و دەچێتە دەر)*.

**ژاک:** خانمی خاوەن میوانخانە، تاوێك دەست راگرە! ناکرێ کۆتایی چیرۆکەکە ئاوا بێ.

**خاوەن میوانخانە:** بۆ ناکرێ! تکایە بە قەدرا سەرەدەرزییەکیش، هیچی لێ کەم و زیاد مەکەن.

*(ژاك خۆ هەڵدەداتە سەر سەکۆ و لە شوێنێکدا کە تازە مارکی ئەوێی بەجێهێشتووە رادەوەستێ. کچە توند باوەش بە لاقیدا دەکا)*.

**کچ**: مسیۆ لومارکی، لێت دەپاڕێمەوە، لانیکەم ئەو هیوایەم تێدا دروست بکە کە دەتوانی لێم خۆش بی.

**ژاک:** هەستە.

**کچ:** *(لە سەر زەوی کەوتووە. ئێستاش هەر دوو ئەژنۆکانی ژاکی لە باوەش گرتووە)* هەر کارێکی پێت باشە لەگەڵمی بکە! ئامادەم هەموو کارێك بکەم.

**ژاك:** *(بە ئاخاوتنێکی دۆستانە و کارتێکراو)* تکایە، تکات لێ دەکەم هەستەوە، خانم... (کچە هێزی *ڕاوەستانی نییە*) زۆر کچی بە ئابڕوو بوونەتە ژنی بێ ئابڕوو، بۆچی جارێکیش ئەم ڕەوتە پێچەوانە نەکەینەوە؟ *(بە ئارامی)* من بەڕاستی لە سەر ئەو بڕوایەم قەت هەرزەیی تۆی خراپ نەکردوە و تەنانەت کەمترین کاریگەریشی لە سەر دانەناوی. هەستە، دەڵێی گوێت لێم نییە دەڵێم چی؟ من دەتبەخشم. تەنانەت لەوپەڕی تووڕەبوونیشدا ناتوانم ئەو بیرە لە مێشکی خۆم دەرباوێم کە تۆ هاوسەرمی. وەرە لەمەودوا، بەڕێز و بە ویژدان بە، وەفادار بە. بەختەوەر بە و بە بەختەوەربوونت بەختەوەرم بکە. هیچ چاوەڕوانییەکی دیکەم لە تۆ نییە هاوسەرە خۆشەویستەکەم، هەستە، هەستە سەرپێ خاتوو لامارکیزە، هەستە. خاتوو دێزارسی هەستە.

*(کچە لە سەر زەوی هەڵدەستێ، باوەش بە ژاك دا دەکا و تامەزرۆیانە ماچی دەکا).*

**خاوەنی میوانخانە:** *(لەو سەری سێنەکەوە هاوار دەکا)* مارکی. ئەوە کەسێکی بێ ڕەوشتە!

**ژاك:** دوولاپوومەری خان، ئاگات لە زارت بێ چی دەڵێی! *(بە کچە)* من لە تۆ خۆش بووم و دەمەوێ دڵنیات بکەمەوە کە تەواو بەڕاستیمە کە دەڵێم لێت خۆش بووم. سەبارەت بەو ژنەش *(ئاماژە بۆ خاوەنی میوانخانە دەکا)* ئەو نەتەنیا نەیتوانیوە تۆڵەی خۆی بکاتەوە، بەڵکو خزمەتێکی زۆر گەورەشی بە من کردوە. مەگەر تۆ زۆر لاوتر، جوانتر و لە ڕادەبەدەر وەفادارتر و دڵپاکتر لەو نی؟ ئێستاش، ئێستا وەرە بچینە شار، بۆ ئەو جێگایەی لەوێ ساڵانێکی پڕ لە بەختەوەری لەبەر دەممانە *(کچەکە لەم سەری دیمەنەکەوە دەچێ بۆ ئەو سەری دیمەن. ئەوجار ڕادەوەستێ و ڕوو لە خاوەن میوانخانە دەکا. لەکاتێکدا کە لە ڕۆڵی مارکی هاتۆتە دەرێ).* خاتوونی خاوەن میوانخانە دەبێ ئەوەت پێ بڵێم کە ئەو ساڵانە، ساڵانێکی پڕ لە خۆشی بوون، چونکە ئاسمان سەری بە پووش نەگیراوە، مانای شتەکان جاری وایە بە هاتنی شتەبایەك، دەگۆڕێن. هەمیشەش بای دێ، جا پێت خۆش بێ یان ناخۆش. با دێ و شادی دەبێتە خەم و تۆڵەش دەبێتە پاداش، ژنێکی بەڕەڵاش دەکرێ ببێتە هاوسەرێکی وەفادار، هێندە وەفادار کە ناتوانی لەگەڵ هیچ کەسێکیتردا هەڵیسەنگێنی.

## دیمەنی دەیەم

*(لە بەرەبەری کۆتایی هاتنی وتەکانی ژاکدا، خاوەن میوانخانە لە سەکۆ دێتەخوار و لە سەر یەکێك لەو*

*کورسیانەی ئاغاکەی ژاکیش لەوێ دانیشتووە، دادەنیشێ.*
*ئاغا دەست دەخاتە نێوقەدی و لەگەڵی دەخواتەوە).*

**ئاغا:** ژاك کەیفم بەو جۆرە کۆتایی پێهێنانەی چیرۆکەکەت نەهات. ئەو کچە شیاوی مارکیزی نییە! ئەو زۆر لە ئاگات دەچێ! هەردووکیان جووتێك خیانەتکاری گەورەن.

**ژاك:** گەورەم، تۆش لە هەڵەدای!

**ئاغا:** دەڵێی چی؟ لە هەڵەدام؟

**ژاك:** زۆر لە هەڵەدای.

**ئاغا:** ژاك تا ئێستا کام نۆکەرت دیوە ئیزنی ئەوە بەخۆی بدا بە ئاغاکەی بڵێ تۆ لە هەڵەدای؟

*(لەکاتێکدا کچەکە لە کاتی ئەو وتووێژەدا لە دیمەنەکە دەچێتەدەر، ژاك لە سەر سەکۆکە خۆهەڵداتە خوارەوە).*

**ژاك:** گەورەم، من هەر ژاکێکی کلۆر و بەتاڵ نیم، مرۆڤێکی وشک و نۆکەر نیم. تۆ دەتوانی وەک هاوڕێیەکی خۆت مامڵەم لەگەڵدا بکەی.

**ئاغا:** *(لەکاتێکدا خاوەن میوانخانەکە دەلاوێنێتەوە)* کاتێك پێت دەڵێم هاوڕێ. هاوڕێمی. کاتێك پێت دەڵێم "ژاك و نۆکەر"، "ژاك و نۆکەر"ی، چونکە هەر بەو شێوەیەی بۆ خۆت و ئەفسەرەکەت دەتانگوت: لەو بان سەرە، لەو سەری سەرەوە، خۆ دەزانی کوێ دەڵێم، وا نووسراوە کە من ئاغام و تۆ نۆکەر. فەرمانت پێ دەدەم قسەکانت لەمەڕ کۆتایی چیرۆکەکە لەوێ بکەیەوە، چونکە نەك هەر تەنیا من، بەڵکو خاتو دوولاپوومەریش ناڕەحەت دەکا کە وەکو خانمێکی بەڕێز و ڕەسەن زۆرم ڕێز بۆی هەیە *(خاوەن میوانخانە ماچ دەکا).*

**ژاك:** گەورەم، بەڕاستی پێت وایە ئەگەر ژاك چیرۆکێکی گێڕایەوە، هێندە کەمە کە حاشای لێ بکا؟

**ئاغا:** ئەگەر ئاغاکەی ئەو داوایەی لێ بکا، بێگومان ژاك حاشا لە چیرۆکەکەی خۆی دەکا.

**ژاك:** قوربان ئێستا ئەو ڕۆژە دانەهاتووە کە ژاک کاری وا بکا!

**ئاغا:** *(لەکاتێکدا بەردەوام خاوەن میوانخانەکە دەلاوێنێتەوە).* ئەگەر ژاك هەروا سور بێ لە سەر دەمبەدمەکردنی لەگەڵ ئاغاکەی، ئاغاش، ژاك دەخاتە نێو گەوڕەکەوە و بۆ ئەوەی ژاک لەناو بزنەکاندا بنوێ!

**ژاك:** دەی باشە، منیش ناچم!

**ئاغا:** *(لەکاتێکدا خاوەن میوانخانەکە ماچ دەکا)* با، دەبێ بچی، خۆ بە دەست خۆت نییە.

**خاوەن میوانخانە:** بەڕێز، پیاوەتیەك دەکەی لەگەڵ ئەو ژنەی کە هەر ئێستا ماچت کرد؟

**ئاغا:** هەرچی بیەوێ بۆی دەکەم.

**خاوەن میوانخانە:** کەواتە کۆتایی بەو شەڕە لەگەڵ نۆکەرەکەت بێنە، دەزانم ئەو کەسێکی بێ چاو و ڕوویە، بەڵام نۆکەر هەر دەبێ وا بێ چاو و ڕوو بێ. مەگین نا؟ لەو سەر سەرەوەیە وا نووسراوە کە ئێوە هەردووکتان ناتوانن بە بێ یەکتری بژین، نە وێک هەڵدەکەن و نە بێک هەڵدەکەن.

**ئاغا:** *(بە ژاک)* گوێت لێیە نۆکەر؟ خاتوو دوولاپوومەری دەڵێ قەت ناتوانم لە دەست تۆ رزگاریم بێ.

**ژاک:** ئاییی، مادام وایە، هەر بۆ ئەوەی لە دەست من رزگاریت بێ، ئەوە دەڕۆمە لای بزنەکان و شەویش هەر لە ناو بزنەکاندا دەخەوم.

**ئاغا:** *(هەڵدەستێتە سەر پێ)* نا، نابێ بچی!

**ژاک:** با دەچم! *(بە ئارامی دەست دەکا بە چوونە دەرەوە لە دیمەنەکە)*.

**ئاغا:** نا، نابێ بچی!

**ژاک:** با، ئەوە دەچم!

**ئاغا:** ژاک! *(ژاک هەروا، بەڵام لەسەرەخۆتر، درێژە بە چوونە دەرەوە دەدا)*. ژاک، رۆڵە، کوڕم! *(ژاک هەروا، بەڵام زۆر لەسەرەخۆتر، درێژە بە چوونە دەرەوە دەدا)*. ژاک، کوڕە خۆشەویستەکەم... *(ئاغا بە دوایدا هەڵدێ و توند پیلی دەگرێ)* باشە، خۆ تۆ گوێت لێ بوو چی گوت؟ من بێ تۆ چی بکەم؟

**ژاک:** باشە. بەڵام ئیزن بدە بۆ ئەوەی قەت بەشەڕ نەیەینەوە، جارێک بۆ هەمیشە هەموو یاساکانمان دیاری بکەین.

**ئاغا:** باشە کاکە، رازیم.

**ژاک:** کەوایە، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوە کە لەو بان سەرە نووسراوە کە بوونی من بۆ تۆ شتێکی پێویست و گرینگە، لە کاتی پێویستدا تۆ دادەدۆشم.

**ئاغا:** شتی وا لەو بان سەرە نەنووسراوە!

**ژاک:** بەسەرت هەموو ئەم شتانە ئەوکاتە نووسراون کە ئاغاکەمان دروستی کردین. ئەوە ئەو بوو کە بڕیاری دا تۆ روخسار و بەژن و باڵات ئاوا بێ و من دڵ و دەروونم پاک بێ. بۆ ئەوەی تۆ فەرمان بدەی و من لە نێویاندا هەڵبژێرم. بۆ ئەوەی تۆ بەهێز بی و منیش کارتێکەر.

**ئاغا:** ئەگەر مەسەلەکە ئاوهایە، باشە، جێگامان دەگۆڕینەوە.

**ژاک:** باشە، تۆ بەم کارە چیت دەست دەکەوێ؟ بێ ئەوەی زات و نێوەرۆک وەدەست بێنین روخساری رواڵەتی و بەژن و باڵات لە کیس دەدەی، بە بێ ئەوەی کاریگەریت وەدەست بێنی دەسەڵاتەکەشت لە دەست دەدەی. گەورەم، هەر بەو شێوەیە بە کە هەی. بەڵێنت پێدەدەم ئەگەر ئاغایەکی باش بی و هەرچیم پێگوتی بەجێی بگەیەنی، منیش هێندە لاساری ناکەم و تووشی ژانە سەرت ناکەم.

**خاوەن میوانخانە**: ئەمن بەو دۆعایە دەڵێم ئامین، بەڵام لەو بان سەرە نووسراوە ئێستا شەو داهاتووە و زگمان تێرە و دەبێ بچینە ناو جێخەو و پێخەفەکانمانەوە.

# پەردەی سێیەم

## دیمەنی یەکەم

*(لە ناو دیمەنەکەدا هەر تەنیا ژاك و ئاغاکەی لێیە)*

**ئاغا:** پێم بڵێ ئەسپەکانمان لە کوێن؟

**ژاك:** ئاغا، ئیتر قسەی قۆڕ مەکە.

**ئاغا:** هەر بەڕاستی شتێکی قۆڕە! باشە چۆن دەکرێ پیاوێکی فەڕانسەیی بە پێیان لەمسەر بۆ ئەوسەری فەڕانسە بە پێیان سەفەر بکا! تۆ دەزانی ئەو کەسەی غیرەتی کرد چیرۆکەکەی ئێمە سەرلەنوێ بنووسێتەوە کێیە؟

**ژاك:** گەورەم، کەرەپیاوێکە! بەڵام ئێستاکە چیرۆکەکەی ئێمە سەرلەنوێ نووسراوەتەوە، چیمان لەدەست دێ، خۆ ناتوانین هیچی لێ بگۆڕین.

**ئاغا:** مردن بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە دەوێرن ئەو شتەی کە نووسراوە سەرلەنوێ بینووسنەوە! چوار پەلیان لە بزمار دەن و لە سەر ئاورێکی نەرم و نیان بیانبرژێنن! بیان خەسێنن و گوێیان ببڕن! کوڕە لاقیشم دێشێن.

**ژاك:** گەورەم، بێعاریان خستە رەشکەوە لە کونی رەشکەوە بۆ خەڵکی دەردێنا. ئی وا، هەموو کەسیش باوەڕ بە قسەکانیان دەکەن.

**ئاغا:** مەبەستت ئەوەیە خەڵك بڕوا بە قسەی ئەو کەسە دەکەن چیرۆکی من و تۆی سەرلەنوێ نووسیوەتەوە؟ زەحمەتی خوێندنەوەی کتێبە سەرەکیەکە و تێگەیشتن لەوە کە ئێمە کێین بە خۆیان نادەن؟

**ژاك:** گەورەم، چیرۆکی ئێمە تەنیا چیرۆکێك نییە کە سەرلەنوێ نووسرابێتەوە. هەر شتێك کە لێرە، لەم خوارەوە، روویداوە بە سەدان جار سەرلەنوێ نووسراوەتەوە، هەتا ئێستا هیچ کەس تەنانەت بیری ئەوەی بەمێشکدا نەهاتووە کە بەڕاستی چی روویداوە. مێژووی مرۆڤایەتی ئەوەندە سەرلەنوێ نووسراوەتەوە و نووسراوەتەوە کە ئیدی خەڵك بۆ خۆشیان نازانن کێن.

**ئاغا:** سەیرە، ئەوە زۆر ترسناکە! ئەوانە *(ئاماژە بە بینەران دەکا)* بڕوا بەوەش دەکەن کە ئێمە تەنانەت ئەسپیشمان نەبووە و مەجبوور بووین وەکو کەسانی ماڵ لەکۆڵ لە سەرتاسەری چیرۆکەکەماندا بە زەحمەت ڕێ ببڕین؟

**ژاک:** *(لەکاتێکدا بینەران نیشان دەدا)* ئەوانە؟ ئەوانە باوەڕ بە هەموو شتێك دەکەن.

**ئاغا:** وادیارە ئەمڕۆ تەواو نی، وەك جاران نی. دەبوو لە میوانخانەی بەرانە کێوی مەزن مابایەنەوە.

**ژاک:** باشە، منیش خۆ زۆرم پێخۆش بوو.

**ئاغا:** دەی قەینا... گوێ شڵ کە. ئەو لە هیچ میوانخانەیەکدا لە دایك نەبووە.

**ژاک:** ئەدی لە کوێ لە دایك بووە؟

**ئاغا:** *(دەڵێی لە خەو دایە)* نازانم. بەڵام شێوەی قسەکردنی، شێوەی ڕێگا ڕۆیشتنی ...

**ژاک:** گەورەم، پێم وابێ خەریکە عاشق دەبی.

**ئاغا:** لەکاتێکدا شانەکانی هەڵدەتەکێنێ، ئەگەر لەو سەرەوە وا نووسرا بێ... *(ڕاوەستان)* ئەها، وەبیرم هاتەوە تۆ هێشتا هەر بە تەواوی بۆت نەگێڕامەوە بۆ خۆت چۆن عاشق بووی.

**ژاک:** تۆ نەدەبوو دوێنێ چیرۆکی خاتوو مادام دوو لاپوومەریت خستبایە پێشەوە.

**ئاغا:** دوێنێ مافی وەپێش کەوتنم بە ژنێکی گەورە دا. تۆ قەت لە مانای ڕێزگرتن لە ژنان تێناگەی. بەڵام ئێستا کە لەگەڵ من بە تەنیای، مافی وەپێشکەوتن دەدەم بە تۆ.

**ژاک:** زۆر سوپاس گەورەم. ئێستا بە وردی گوێ ڕاگرە. پاش ئەوەی لەو کچەتیوە بوومە پیاو، چوومەدەر و خۆم سەرخۆش کرد، باوکم لێی دام. پاش ئەوەی باوکم لێی دام، ڕەگەڵ هێزێکی سەربازی کەوتم کە لەو کاتەدا بەوێدا تێدەپەڕین...

**ئاغا:** ژاك، دیسان هەر ئەو قسانەی جاران دووپات دەکەیەوە.

**ژاک:** من؟ دیسان هەر ئەو قسانەی جاران دەڵێمەوە؟ بەڕاستیتە گەورەم؟ هیچ شتێك شەرمەزارتر لەوە نییە کە ئەو قسانەی گوتوومانن دووپاتی بکەینەوە. نەدەبوو ئەو قسەت پێگوتبام، ئیدی هەتا کۆتایی شانۆکە وستە ناکەم، یەك قسەش ناکەم.

**ئاغا:** تکات لێ دەکەم، ژاك، عەرز و ئاسمانت بۆ دێنمە تکا.

**ژاک:** تۆ لە من دەپاڕێیەوە؟ ئێستا ئیدی وات لێ هاتووە لێم بپاڕێیەوە؟

**ئاغا:** بەڵێ.

**ژاک:** زۆر باشە. باسی چیم دەکرد؟

**ئاغا:** تازە باوکت لێیدابووی. ڕەگەڵ مەفرەزەیەکی عەسکەری کەوتی کە لەو کاتەدا بەوێدا تێدەپەڕی. تووشی کۆخێك بووی کە ژنێکی سمت پان دەرمانی دەکردی... *(لە پڕ رادەوەستێ)*. ژاك، گوێ لە قسەکەم بگرە ژاك... دەمەوێ بە روونی قسە بکەی... تەواو بێ پێچ و پەنا، بێ ڕوودەربایستی، تێدەگەی؟ هەر بەڕاستی ئەو ژنە سمتی گەورە بوون یان لەبەر ئەوە وا دەڵێی کە من دڵخۆش بکەی؟

**ژاک:** دە ماڵتە بۆ هێندە لە سەر شتی قۆڕ دەڕۆی؟

**ئاغا:** *(خەمۆکانە)* قوونی هێندەش پان و پۆڕ نەبوو، ها؟

**ژاك:** *(لەسەرەخۆ و ئارام)* شتی وا مەپرسە، گەورەم. بۆ خۆت دەزانی قەت حەز ناکەم درۆت لەگەڵ بکەم.

**ئاغا:** *(خەمۆکانە)* ژاك، ماڵت بە قوڕ نەگیرێ سەرت لە منیش شێواندوە.

**ژاك:** دڵت لێم نەیەشێت.

**ئاغا:** *(خەمۆکانە)* چۆن شتی وا دەبێ، ژاك، کوڕم دەزانم لە دڵەوە زۆرترین خۆشەویستیت بەرانبەر بە من هەیە.

**ژاك:** بەڵێ، گەورەم، دەزانم ئەو ژنانەی قوونپانن، چ مانایەکیان لە لای تۆ هەیە.

**ئاغا:** ژاك، تۆ پیاوێکی باشی. تۆ نۆکەرێکی بە بەزەییت. نۆکەر دەبێ دڵۆڤان بێ و شتی وا بە ئاغاکەی بڵێ کە ئەو پێی خۆشە بیبیستێ. ژاك، خۆت لەو ڕاستیانەی پێویست ناکا باسیان بکەی، ببوێرە.

**ژاك:** گەورەم، هیچ نیگەرانی ئەوە مەبە. منیش حەزم لەو ڕاستیە زیادە و لابەلایانە نییە. هیچ شتێکم پێ شک نایە کە لە هەقیقەتێکی لابەلا و ناپێویست خراپتر بێ.

**ئاغا:** وەکو چی؟

**ژاك:** وەکو ئەوەی کە ئێمە ڕۆژێك هەر دەمرین. یان ئەو شتەی کە پڕووپووچ و گەندەڵە. وەك بڵێیت پێویست بووە کە لەو بابەتەیان تێگەیاندبایەین. ئەو جۆرە مرۆڤانەت قەت دیوە کە وەکو پاڵەوان دێتە دیمەنەوە و هاوار دەکەن "دنیا گەندەڵ و بێ نرخە". دیوتە، بینەرانیش چەپڵەی بۆ لێدەدەن، بەڵام ئەوە بە هیچ شێوەیەك سەرنجی ژاك بۆ لای خۆی ڕاناکێشێ، چونکە ژاك دوو سەد ساڵ، چوار سەد ساڵ، هەشت سەد ساڵ لەمەوبەر لەو بابەتە ئاگادار بۆتەوە و کاتێك ئەو جۆرە کەسانە دەبینێ کە وەك ئەو هاوار دەکەن "دنیا گەندەڵە"، ژاک هیچ سەرنجێکیان ناداتێ و لەوەش گرینگتر بۆ ژاک ئەوەیە کە دڵی ئاغاکەی خۆی خۆش بکا ...

**ئاغا:** ... ئاغا گەندەڵەکەی...

**ژاك:** ئاغا گەندەڵەکەی بە باسکردنی ژنی قوونپان دەگەشێتەوە.

**ئاغا:** هەر خۆم دەزانم، هەر من و ئەو کەسەی لەو سەرەیە دەزانین کە تۆ لە هەموو ئەو نۆکەرانەی هەتا ئێستا نۆکەرییان کردوە باشتری.

**ژاك:** جا کەوایە ئیدی هیچ پرسیارێك مەکە، هەوڵ مەدە لە ڕاستییەکان تێبگەی. هەر گوێ بدەیە قسەکانم: سمتی گەورە بوو... دا ڕاوەستە... خەریکم باسی کامیانت بۆ دەکەم؟

**ئاغا:** باسی ژنێك کە لە کۆخێکدا بوو و تۆیان بۆ ئەوێ برد.

**ژاك:** ئەها، بەڵێ. حەوتوویەك لەوێ کەوتم، لەم ماوەیەدا دوکتۆرەکان تەڕاییان لە شووشە شەڕابەکانیاندا نەهێشتەوە. شتێکی سەیر نەبوو ئەگەر لە خودایان دەویست لێخەیان ببمەوە. یەکێك لە دوکتۆرەکان کە نەشتەگەر بوو، ژنێکی هەبوو کە داوای کرد من لە لای خۆی دامەزرێنێ، بەم شێوەیە چوومە ئەوێ بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەوان بژیم.

**ئاغا:** کەواتە هیچ شتێك لە نێوان تۆ و ئەو ژنە جوانەی ناو قۆخەکەدا ڕووی نەدا.

**ژاك:** نا.

**ئاغا**: شەرم ناکەی جا. بەڵام گرنگ نییە! باسی ژنی دوکتۆرم بۆ بکە، هەر ئەو کەسەی داوای کرد تۆ لە لای خۆی دامەزرێنێ، ئەو چۆن بوو؟

**ژاک**: قژی زەرد بوو.

**ئاغا**: وەك ئاگات.

**ژاک**: لاق و لەتەری درێژ.

**ئاغا**: گەڵ و قوونی زۆر لە هی ئاگات دەچوو؟

**ژاک**: *(لەکاتێکدا نیشانی دەدا)* ئاوها بوو، گەورەم، ئاوها.

**ئاغا**: راست وەکو ئاگات. *(بە تورەییەوە)* ئاخ، ژنەتیوی پووچەکە! هەڵسوکەوتی من لەگەڵ ئەو خراپتر بوو یان لەگەڵ مارکی دێزارسی ساختەچی! یان هەڵسوکەوتی بیگری لاو لەگەڵ ژووستینەکەی!

*(سێن-ئۆوێن هاتۆتە سەر سەکۆکە و خەریکە تامەزرۆیانە گوێ لە قسەکانی ژاك و ئاغاکەی رادەگرێ).*

**سێن-ئۆوێن**: بۆچی تۆ نا؟

**ژاك**: *(بە ئاغاکەی)* گوێت لێیە گاڵتەت پێ دەکا؟ گەورەم، ئەو کەسێکی سوکە. هەر یەکەمجار کە باسی ئەوت بۆ کردم پێم گوتی ئەو چۆن پیاوێکە.

**ئاغا**: کەرەپیاوە، بەڵام هەتا ئێستاش کارێکی وەها خراپی نەکردوە کە تۆ لەگەڵ بیگری هاوڕێت کردت.

**ژاك**: وایە، بەڵام ئەو کەسێکی پەستە، نەك من.

**ئاغا**: *(لەکاتێکدا کە لە راستی قسەکەی ژاك حەپەساوە)* باشە، قسەکەت راستە. هەردووکتان ژنی باشترین هاوڕێکانی خۆتان هەڵفریواندووە، قەینا با هەر ئەو کەسێکی پەست بێ، نەك تۆ. بەڵام تۆ چۆن ئەو شتە پاساو دەدەی؟

**ژاك**: نازانم گەورەم. بەڵام هەست دەکەم راستییەکی قووڵ لە ناخی ئەم مەتەڵەدا خۆی حەشار داوە.

**ئاغا**: وایە! منیش ئاگاداری ئەو هەقیقەتەم! ئێوە لە هەڵسوکەوتدا جیاواز نین، بەڵکو رۆحتان جیاوازە! تۆ سەرنجی ژنی بیگری هاوڕێت راکێشاوە، بەڵام دواتر خەم و خەفەت دایگرتی....

**ژاك**: پێم خۆش نییە بڵێم ئەوەی تۆ دەیڵێی هەموویان بڵقی سەر ئاون. خەم و خەفەتی چی... دنیا بە کەیفی من بوو، دەتگووت رۆنیان لە قالبم هەڵسووە...

**ئاغا**: مەبەستت ئەوەیە لەبەر پەژیوانی خۆت سەرخۆش کردبوو؟

**ژاك**: پێم عەیبە بڵێم بەڵێ، بەڵام هەر بەو جۆرە بوو کە گوتم.

**ئاغا**: ژاك، کارێکم بۆ دەکەی؟

**ژاك**: بۆ تۆ؟ قوربان هەرچی بفەرمووی بە چاوان.

**ئاغا**: وەرە با لەسەر ئەوە پێکەوە رێک بکەوین کە تۆ نوقمی خەفەت بوویت.

**ژاك**: ئەگەر تۆ ئاوەهات دەوێ، باشە، گەورەم.

**ئاغا**: من وام دەوێ.

**ژاک**: باشە، گەورەم. من نوقمی خەم و خەفەت بووم.

**ئاغا**: سوپاس. دەمەوێ ئەوەندەی بۆم دەکرێ، ڕاشکاوانە لە نێوان تۆ و ئەو پیاو پەستەدا جیاوازی دانێم *(دەگەڕێتەوە بۆ لای سێن-ئۆوێن کە ئێستاش هەر لە سەر سەکۆیە)* کە بەڕاستی، هەر تەنها بە ڕاکێشانی سەرنجی ژنەکەی من ڕازی نەبوو... *(دەچێتە سەر سەکۆ)*.

## دیمەنی دووەم

**سێن-ئۆوێن**: هاوڕێی خۆشەویست، کاتی ئەوە هاتووە کە لە بیری تۆڵەدا بین! چونکە ئەو ژنە پەستە فێڵی لە هەردووکمان کردوە، داوا دەکەم پێکەوە تۆڵەی لێ بکەینەوە!

**ژاک**: بەڵێ، لە بیرمە، هەر لێرەدا بوو کە وازمان لە چیرۆکەکەمان هێنا، باشە، ئاغا، تۆ چیت بەم خائینە گوت؟

**ئاغا**: *(لەکاتێکدا لە سەر سەکۆوە چاو لە ژاك دەکا، بە جۆرێکی خەمهێنەرانە )* چیم پێ گوت؟ ژاك، چاو لە من بکە. کوڕم، سەیری من بکە و بە حاڵی چارەنووسم بگری. *(بە سێن ئۆئێن دەڵێ)* گوێ بگرە، سێن-ئۆوێن بە مەرجێك ئامادەم لە خیانەتی تۆ خۆش بم.

**ژاك**: دەك بژی ئاغا، کوڕە نەهێڵی لینگان بە سەر شانتدا بەرداتەوە و سواری شان و ملت بێ.

**سێن-ئۆوێن**: هەرچی تۆ بیڵێی قوربان، بەوە ڕازی دەبی کە خۆم لە پەنجەرەوە فڕێدەمە خوارێ؟ *(ئاغا پێدەکەنێ و وڵام ناداتەوە)* خۆم هەڵواسم؟ *(ئاغا وڵام ناداتەوە)*. خۆم بخنکێنم؟ (ئاغا وڵام *ناداتەوە*) خەنجەرێك لە سینگم ڕۆکەم؟ ئەرێ، وا بکەم! *(کراسەکەی دەکاتەوە، خەنجەرێك هەڵدەگرێ و بەرەو سینگی ڕای دەگرێ)*.

**ئاغا**: ئەو خەنجەرە دانێ. *(خەنجەرەکەی لە دەستی دەستێنێ)*. وەرە با بخۆینەوە، دواتر داوایەکی گەلێک ساکارم لێت هەیە کە لە وڵامی داوای لێبوردن لە من دەتوانی بیکەی ... کەواتە ئاگات هەر بەو شێوەیەی کە نیشان دەدا پڕ کوڵ و هەستە!

**سێن-ئۆوێن**: ئەها، دەتەوێ باسی شەوێک لەو شەوانەت بۆ بگێڕمەوە کە لەگەڵ ئاگاتدا خەوتبووم؟

**ئاغا**: نازانی چەندەم کەیف بەوە دێ! بەڵێ، هەر ئەوەم لێت دەوێ! مەگەر ئەوە داواکاریەکی زۆر گەورەیە؟

**سێن-ئۆوێن**: نا گەورەم. داوایەکی گەلێک ئاسانە. لە ڕاستیدا، ئەگەر لە جیاتی گێڕانەوەی شەوەکە، هەر شەوەکە بدەم بە خۆت، دەڵێی چی؟

**ئاغا**: شەوەکە؟ شەوێکی ڕاستەقینە؟

**سێن-ئۆوێن:** *(لەکاتێکدا دوو کلیل لە گیرفانی دەردێنێ)* ئەم کلیلە بچووکە دەرگای پێشەوە دەکاتەوە، کلیلە گەورەکەش دەرگای ژووری کەوش داکەندنی ئاگات دەکاتەوە، هاوڕێم، من شەش مانگی ڕەبەق بە یارمەتی ئەو کلیلانە خۆم تێرگان کردبوو. هێندە لەو شەقامەدا پیاسە دەکەم هەتا گوڵدانی ڕێحانە لەبەر پەنجەرەکەوە دەردەکەوێ. دەرگای ماڵەکە دەکەمەوە و پاشان بە ئارامی پێوەی دەدەمەوە. لە سەر پەنجان بە پلیکانەکاندا دەچمە سەر. دەرگای ژوورەکە دەکەمەوە. لە دەرەوەی ژووری کەوش داکەندن، کۆمێدێکی لێیە کە هەر لەوێ جلوبەرگەکەم دادەکەنم. ئاگات ئەو دەرگایەی کە دەچێتە ژووری خەوەکەی بە کراوەیی دەهێڵێتەوە و لە سەر جێگا خەوەکەی، لە تاریکیدا، چاوەڕێم دەبێ.

**ئاغا:** ڕێگام دەدەی بێمە جێگای تۆ؟

**سێن-ئۆوێن:** بە گیان و دڵ، تەنیا تکایەکی چووکەم لێت هەیە.

**ئاغا:** بیڵێ!

**سێن-ئۆوێن:** ئیزن دەدەی بیڵێم؟

**ئاغا:** تکایە بیڵێ. هیچ شتێکم ناوێ جگە لەوەی تۆ خۆشحاڵ بی.

**سێن-ئۆوێن:** تۆ باشترین هاوڕێی، کەس ناتوانێ وەک تۆ هاوڕێیەکی باش بێ.

**ئاغا:** لە تۆ باشترم. ئێستا پێم بڵێ بزانم دەتوانم چیت بۆ بکەم.

**سێن-ئۆوێن:** پێم خۆشە هەتا بەیانی لە پاڵیدا بی. من دێمە سەر سێن و خافڵگیرتان دەکەم.

**ئاغا:** *(لەکاتێکدا واقی وڕماوە، بە پێکەنینێکی کورتخانەیەن)*. بیرێکی باشە! بەڵام تۆزێک زاڵمانە نییە؟

**سێن-ئۆوێن:** زاڵمانە؟ نا واش نییە. لە ڕاستدا پێکەنیناویشە. منیش جلوبەرگەکانم لە لای کۆمێدی جلوبەرگەکان دادەکەنم و کاتێك خافڵگیرم کردن، بۆ خۆشم...

**ئاغا:** خۆت ڕووت دەکەیەوە! ئای ئای، کەرکەرێنە! بەڵام چۆن کارەکە ڕێکخەین؟ ئێمە خۆ هەر دەستە کلیلێکمان پێیە...

**سێن-ئۆوێن:** پێکەوە دەچینە ناو ماڵەکە، پێکەوە جلوبەرگەکانمان دادەکەنین، بەڵام تۆ لە پێشدا دەچیە لای. هەر کە ئامادە بووی، ئیشارەیەك بۆ منیش بکە و منیش دێمە لاتان!

**ئاغا:** زۆر باشە! شتێکی سەیر دەبێ!

**سێن-ئۆوێن:** کەواتە ڕازیت؟

**ئاغا:** ئەرێ، بێ یەک و دوو! بەڵام...

**سێن-ئۆوێن:** بەڵام چی...

**ئاغا:** بەڵام... چاولێکە، من... نا نا، بە بێ هیچ مەرجێك ڕازی دەبم. تەنیا ئەوە کە چونکە هەوەڵ جارە، وام پێ باشە بە تەنیا بم... ڕەنگە دواتر بتوانم...

**سێن-ئۆوێن:** ئەها، تێگەیشتم. دەتهەوێ چەند قات زیاتر تۆڵەی لێ بکەیتەوە.

**ئاغا:** تۆڵەسەندنەوە شتێکی زۆر خۆشە...

**سێن-ئۆوێن:** تەواو ڕاستە. *(سەر بۆ لای دیمەنی سەرەوە و بۆ شوێنێك رادەوەشێنێ کە ئاگات لە سەر پلیکانەکان درێژ بووە. ئاغا وەك بڵێی تووشی کاریگەرییەکی سیحراوی بووە بۆ لای دەچێ، ژنەکە*

*باوەشی بۆ دەکاتەوە).* هێواش بە! لەسەرەخۆ! هەموو خەوتوون! *(ئاغا لە پاڵ ئاگات رادەکشێ و لە باوەشی دەگری...)*

**ژاك**: ئاغا، پیرۆزباییت پێ دەڵێم، بەڵام زۆر نیگەرانتم.

**سێن-ئۆوێن**: *(لە سەر سەکۆوە، بە ژاك دەڵێ)* کوڕم، بە پێی هەموو یاساکان نۆکەر دەبێ خۆشحاڵ بێ کاتێک دەبینێ ئاغاکەیان فریو داوە.

**ژاك**: ئاغاکەی من کەسێکی نازدارە، قەت لە قسەم دەرنەچووە و هەر کارێکی بیڵێم دەیکا. قەت پێم خۆش نییە ببینم ئاغاکانی دیکە فریوی دەن و بیکەنە دەستەمۆی خۆیان، هیچیان وەک ئەو باش نین.

**سێن-ئۆوێن**: ئاغاکەی تۆ پیاوێکی کەرە، لێگەڕێ با هەموو شتێکی بە سەر بێ.

**ژاك**: رەنگە تۆزێک کەر بێ، بەڵام جاروبار عەقڵێکی باش دەبێتە میوانی. عەقڵێکی وەها کە هیچ کەسێکی عاقڵیش نییەتی.

**سێن-ئۆوێن**: وەڵڵا بابە جوانە! قەت نۆکەرم نەدیوە زگی بە ئاغاکەی بسووتێ و بەزەیی بە ئاغاکەی خۆیدا بێتەوە! جوان چاولێکە و بزانە ئەم بەسەرهاتە ئاغاکەت بەرەو کوێ دەبا.

**ژاك**: جارێ بەختەوەرە، منیش بۆی خۆشحاڵم!

**سێن-ئۆوێن**: دەیبینین!

**ژاك**: پێم وتی، ئەو ئێستا خۆشحاڵە و هەر ئەوەش بۆ من بەسە. مرۆڤ دەتوانێت چی بێت جگە لەوەی کە لە ئێستادا بەختەوەر بێت. چی لە دەست دێ؟

**سێن-ئۆوێن**: راستە، بەڵام ئەو بۆ ساتێك بەختەوەری نرخێکی زۆر دادەنێ؟

**ژاك**: بەڵام ئەگەر خۆشیی ئەم ساتە کورتە هێندە زۆر و مەزن بێ کە تەنانەت هەموو ئەو چارەڕەشیانەی بۆت ئامادە کردوە نەتوانێت بەسەریا زاڵ بێت چی؟

**سێن-ئۆوێن**: دەمت داخە، نۆکەر! ئەگەر پێم وابووایە کە چێژێکی زیاتر لە ئازار دەدەمە ئاغا گەمژەکەت، بەڕاستی ئەو خەنجەرەم لە سینگم رۆ دەکرد. *(ڕووە و سووچی دیمەنی سەرێ)* دەی خێراکەن. زوو تەواو بن. لەگەڵ ئێوەمە! زوو بن! ئەوە تاو هەڵات، بەسە!

# دیمەنی سێیەم

*(هەراو هۆریاییەکی زۆر لە دەرەوەی دیمەنەکە دێ. پاشان کۆمەڵێك خەڵك، لەگەڵ دایك و باوکی ئاگات بە جلوبەرگی خەو و مەئمووری پۆلیسەوە هێرش دەکەنە سەر ئەو پلیکانانەی کە ئاغا و ئاگات لەسەریان تێکهاڵاون).*

**مەئمووری پۆلیس:** خوشکان و برایان، تکایە بێدەنگی بپارێزن. بەڵگەکە زۆر روون و حاشا هەڵنەگرە، پیاومان لە سەری گرتووە. ئەگەر هەڵە نەبم، تاوانبار کەسێکی ئاغازادەشە. دڵنیام بۆخۆی وای پێ باشترە کە خۆی دان بەو هەڵەیەدا بنێ کە تووشی بووە، نەك ئەوە کە چاوەڕوانی یاسا بێ و بە زەبری یاسا ئەو کارەی پێ بکەن.

**ژاک:** ئاخ خوایەگیان، گەورەم دواجار تووش بووی؟

**باوکی ئاگات:** *(لەکاتێکدا دەستی دایکی ئاگات دەگرێ کە دەیهەوێ لە ئاگات بدا)*. لێی گەڕێ! دنیا هەر وا نابێ...

**دایکی ئاگات:** *(بە ئاغا)* پێم وابوو پیاوێکی زۆر بەڕێز و باشی. کێ پێی وابوو تۆ.

**مەئمووری پۆلیس:** *(بە ئاغا کە ئێستا لە سەر پلیکانەکان راوەستاوە)* بەڕێز، بە دووومدا وەرە.

**ئاغا:** بۆ کوێم دەبەی؟

**مەئمووری پۆلیس:** *(لەکاتێکدا دەیەوێ بۆ دەرەوەی ببا)* بۆ زیندان.

**ژاک:** *(بە واق وڕماوی)* بۆ زیندان.

**ئاغا:** *(بە ژاک)* بەڵێ، کوڕم بۆ زیندان...

*(مەئمووری پۆلیس دەچێتە دەر. ئەو خەڵکەی لە دەوروبەری پلیکانەکان کۆببوونەوە، ئەوێ بەجێ دێڵن. ئاغا لە سەر سەکۆ بە تەنیا ماوەتەوە. سێن-ئۆوێن بەپەلە دەچێتە لای).*

**سێن-ئۆوێن:** ئاخ، هاورێ زۆر خۆشەویستەکەم! شتێکی زۆر ترسناک و خەمهێنەرە! تۆ لە زینداندا! چۆن شتی وا دەبێ؟ هەر ئێستا لە ماڵی ئاگاتەوە هاتووم. دایك و بابی ئاگات قسە لەگەڵ منیش ناکەن. ئەوان دەزانن کە تۆ تەنیا دۆست و هاوڕێی منی و تاوانی چارەڕەشیەکەیان دەخەنە ئەستۆی من. هێندەی نەمابوو ئاگات هەر دوو چاوم دەربێنێ. لێم تێدەگەی...

**ئاغا:** سێن-ئۆوێن هەر تۆ دەتوانی لە زیندان رزگارم بکەی.

**سێن-ئۆوێن:** چۆن؟

**ئاغا:** چۆن؟ بەوەی کە راستییەکە بدرکێنی.

**سێن-ئۆوێن:** بەڵێ، هەڕەشەم لە ئاگاتیش کردوە کە راست هەر ئەو کارە دەکەم. بەڵام راستیت دەوێ، ناتوانم وا بکەم. بیری لێ بکەوە ئەوجار چۆن بیر لە سەر هەردووکمان دەکەنەوە... جگە لەوەش، هەمووی هەر خەتای خۆت بوو!

**ئاغا:** خەتای من بوو؟

**سێن-ئۆوێن:** بەڵێ، خەتای خۆت بوو! ئەگەر بەو داوا پڕ لە هەرزە و سەرشۆڕییەی من رازی بوویتایە، ئاگاتیان لەگەڵ دوو پیاودا دەگرت و ئێستا هەموو تاوانەکان دەکەوتنە ئەستۆی ئەو و هەر ئەویش خۆی کۆتایی بەم گاڵتەجاڕییە دێنا. هاوڕێم، تۆ لە رادەبەدەر فیزەون و لوتبەرز بووی! دەبوو هەموو هەوڵێکت دابایە بۆ ئەوەی ئەو کچە وەدەست بێنی!

**ئاغا:** سێن-ئۆوێن!

**سێن-ئۆوێن:** هاوڕێ، دنیا هەر وایە. تۆ بە هۆی لە خۆڕازیبوونتەوە سزا دەدرێی.

**ئاغا:** *(بە ئاخاوتنێکی پڕ لە سەرکۆنەوە)* هاوڕێم!

*(سێن-ئۆوێن لە سەر پاژنە لاق دەسووڕێ و دەچێتە دەر).*

**ژاك:** *(روو لە ئاغا)* هەی بە لەعنەت بی! ئەتۆ کەی دەست لە هاوڕێیەتی شتی وا هەڵدەگری؟ هەموو کەس پێی وایە شتەکە داوێک بووە بۆ تۆ. ئەمە هەر ئەو کەسە بوو کە تۆی تاوانبار کرد! بەڵام نا، تۆ بۆ هەمیشە چاوت داخستووە و هیچ نابینی! ئێستا خەڵك گاڵتە بە منیش دەکەن کە من نۆکەری کەرەپیاوێکی وەك تۆم.

## دیمەنی چوارەم

**ئاغا:** *(بەرەو لای ژاك دەگەڕێتەوە و وێرای قسەکردن لەگەڵ ژاکدا لە سەکۆ دێتەخوار)* ژاك، کوڕم، خۆزگە ئەویش هەر گەمژە دەبوو و بەس. بەڵام ئەو جگە لە گەمژەیی، کەسێکی کلۆڵ و داماویش بوو. جا ئەوە یەکجار خراپە. دوای ئەوەی لە زیندان بەربووم، ناچار بووم بە پارەیەکی زۆر ئەم پەڵە رەشەی سەر شەرەفی کچەکەیان پاك بکەمەوە.

**ژاك:** *(لە رووی دڵدانەوەوە)* گەورەم، شتەکە دەکرا لەوەش خراپتر بێ، وای دانێ کچەکە زگی پڕ بووایە.

**ئاغا:** راست دەکەی ژاک، چاکی بۆچووی.

**ژاك:** چی؟

**ئاغا:** وایە.

**ژاك:** زگی پڕ بوو؟ *(ئاغا بە نیشانەی بەڵێ سەری دەلەقێنێ و ژاك لە باوەشی دەگرێ).*

**ئاغا:** ئاغا بچکۆڵە کلۆڵەکەم! ئێستا ئیدی دەزانم کارەکە چەندە پیس بووە و کۆتایی کارەکەش چەندە خراپ بووە.

*(لەسەرتاسەری ئەو دیمەنەدا، وتووێژی نێوان ژاك و ئاغاکەی پڕ و ئاخنراو لە خەمێکی قووڵە و بەتەواوی دوورە لە گاڵتە و تەنز).*

**ئاغا:** نەك تەنیا پارەی سڕینەوەی ئەو پەڵە ڕەشەی سەر شەڕەفی ئەو کچە هەرزەیە چکۆلەیەم دا، بەڵکو ئەمریان پێ کردم کە دەبێ تێچووی منداڵ بوونەکەش بدەم. بیری لێ بکەوە، خەم و مەراقی تێچووی پەروەردەکردنی منداڵێکی تووڵە لەولای ڕاوەستێ کە ڕێک لەگەڵ سێن-ئۆوێن دەڵێی سێوێکن و کراون بە دوو لەتەوە.

**ژاك:** تێگەیشتم. خراپترین کۆتایی چیرۆکی مرۆڤ لە دایك بوونێکە. خاڵێکی ناپیرۆز لە کۆتایی بەسەرهاتدا. پەڵەیەك لە کۆتایی ئەویندا. باشە، ئەو، مەبەستم کوڕەکەتە، ئێستا تەمەنی چەندە؟

**ئاغا:** دە ساڵ دەبێ. لە تەواوی ئەم دە ساڵەدا لە گوندێك ژیاوە. دەمەوێ لە سەر ڕێمان لەو گوندە لادەم و حیساب لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکەم کە ئەو ماوەیە بەخێویان کردوە، بەشکەم ئەو لوت بۆگەنە بچکۆلەیەش بەر خوێندن بدەم.

**ژاك:** ئاغا چکۆڵە غەمگینەکەم، لە بیرتە کاتێك ئەوانە *(ئاماژە بە بینەران دەکا)* لە منیان پرسی دەچنە کوێ، من وڵامم دایەوە "کێمان دەزانین دەچینە کوێ؟" بەڵام تۆ هەر لە سەرەتای کارەوە دەتزانی دەچینە کوێ.

**ئاغا:** پێم وایە دەیکەم بە سەعاتساز، یان دارتاش. بەڵێ، دارتاشم بێ باشترە. دڵنیام ئەو دەستێکی باشی دەبێ لە دروستکردنی کورس و هەروەها زۆر منداڵانیش دەخاتەوە. منداڵەکانی ئەویش زۆر منداڵ و کورسی دیکە دروست دەکەن. دیسان منداڵەکانی ئەوانیش دنیایەک کورسی و منداڵی دیکە دروست دەکەن ...

**ژاك:** بەو جۆرەی تۆ دەیڵێی، دنیا پڕ دەبێ لە کورسی و منداڵ. ئەتۆش بەو کارەت تۆڵەی خۆت دەکەیەوە.

**ئاغا:** *(بە رکوونی و رقەوە)* ئیدی هیچ سەوزەڵانییەک شین نابێ و هیچ گوڵێکیش ناڕوێ. هەموو شوێنێك پڕ دەبێ لە منداڵ و کورسی.

**ژاك:** منداڵەکان و کورسیەکان، کورسیەکان و منداڵەکان، بەڕاستی ئەوە شتێکی گەلێک ترسناکە. گەورەم ئێمە زۆر بەختەوەرین! پێش ئەوەی ئەو وەختە دابێ، لە کاتێکی باشدا دەمرین کە ئەو سەردەمە نابینین.

**ئاغا:***(لە قووڵایی بیرکردنەوە دایە)* بەڕاستی هومێدەوارم، ژاك، چونکە زۆر جار بیرکردنەوە لە دووبارەبوونەوەی کورسیەکان و منداڵەکان و ئەو هەمووە... تووشی پەشۆکانم دەکا. دەزانی دوێنێشەو لەو کاتەدا گوێم بۆ چیرۆکی خاتوو دوولاپوومەری ڕاگرتبوو چیم لە خۆم دەپرسی؟ پرسیم ئایا هەموو چیرۆکێکی نوێ هەر هەمان چیرۆکی پێشوو نییە؟ لەسەریەک خاتوو دوولاپوومەری هاوشێوەی سێن-ئۆوێنە، ئێستا منیش ڕێک وەک بیگر، ئەو هاوڕێ کلۆڵەی تۆ. بیگریش کەسێك نییە جگە لە هاوتای

هەڵخەڵەتاوی کەسێکی وەك مارکی. بەبڕوای من، ژووستن و ئاگات هیچ جیاوازییەکیان نییە. ئاگات هاوتای ئەو قووڵە بچکۆڵە بێئەخلاقە کە دواجار مارکی ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێك هێنا.

**ژاك:** (*بیرمەندانە*) بەڵێ، گەورەم، وەکو چەرخ و فەلەك وایە. دەزانی، باپیرم، هەر ئەو کەسەی هەموو شەوێك منی بێدەنگ دەکرد و بۆ خۆی کتێبی پیرۆزی دەخوێندەوە کە قەتیش خۆشی لەو شتە نەدەهات کە دەیخوێندەوە، تەنانەت دەیگوت کتێبی پیرۆز پڕە لە دووپاتبوونەوە و ئەوەشی دەگوت کە هەر کەس قسەی دووپاتکراوە بڵێ، ئەوە بیسەرەکانی بە گەمژە دەزانێ. دەزانی ئاغا، من چیم لە خۆم دەپرسی؟ باشە ئەو کەسەی کە لەو سەرسەرانەوە کە هەموو شتەکان دەنووسێ، قسەکانی هێندە دووپاتە نین؟ تۆ بڵێی ئەویش ئێمە بە گەمژە نەزانێ ... (*ژاك بێدەنگ دەبێ و ئاغا ئەوەندە نارەحەتە کە ناتوانێ هیچ دژکردەوەیەك نیشان بدا. دوای ساتێک بێدەنگی، ژاك تێدەکۆشێ ئارامی بکاتەوە*). بەڵام ئای خوایە گیان، گەورەم، هێندە خۆت وا لێ مەکە. باشە من چ بکەم و چۆن لەم خەمە رزگارت بکەم. ئەها، دەزانم چۆن، ئاغا بچکۆلە خۆشەویستەکەم، وەرە با بەسەرهاتی عاشق بوونی خۆمت بۆ بگێڕمەوە.

**ئاغا:** (*بە دەنگێکی خەمناکەوە*) حەق بەتۆیە ژاک، راست دەکەی، باشە کوڕی خۆم، وەرە بۆم بگێڕەوە بزانم چۆن عاشق بووی.

**ژاك:** ئەو رۆژەی کوڕێتیم لە دە ست دا، چوومە دەر و سەرخۆش بووم.

**ئاغا:** وایە، دەزانم.

**ژاك:** ئاه، پێمناخۆشە کە دەیزانی، کەواتە هەتا باسی ژنی نەشتەرگەرەکە ناگێڕمەوە.

**ئاغا:** کەواتە ئەو ژنە، هەر ئەو ژنەیە کە عاشقی بووی؟

**ژاك:** نا.

**ئاغا:** (*لەکاتێکدا بە ترسەوە چاو لە دەوروبەری خۆی دەکا*) باشە، ئەویش بەجێ بێڵە و خێرا بچۆ سەر بەشەکانیتر.

**ژاك:** بۆچی هێندە بەپەلەی؟

**ئاغا:** ژاك دڵم خەبەری داوە کە زۆرمان کات بە دەستەوە نەماوە.

**ژاك:** گەورەم، دەمترسێنی؟

**ئاغا:** شتێك پێم دەڵێ، باشتر وایە خێرا چیرۆکەکەت بگێڕیەوە.

**ژاك:** زۆر باشە گەورەم. پاش حەوتوویەك پشوودان لە ماڵی نەشتەرگەردا، بۆ پیاسەکردن چوومە دەرەوە. (*ژاك چۆتە ناو بیری چیرۆکەکەی خۆی، بۆیەش زۆرتر چاو لە بینەران دەکا و کەمتر سەیری ئاغاکەی دەکا. بە شێوەیەکی سەیر هۆگری ناوچە گوندییەکان بووە*) رۆژێکی جوان بوو، من هێشتاش هەر دەشەلیم...

**ئاغا:** دەزانی ژاك، پێم وابێ هێندەمان نەماوە بگەینە ئەو دێهاتەی کوڕە زۆڵەکەم لەوێ دەژی.

**ژاك:** ئاخ ئاغا لە دەست تۆ، لە خۆشترین ساتی چیرۆکەکەمدا هاتیە ناو قسەکانمەوە! هێشتاش هەر دەشەلیم و ئەژنۆم لەتاو ئێشی زۆر زیرەزیری بوو، بەڵام رۆژێکی خۆش بوو، وەك ئێستا لە بیرم ماوە (*سێن- ئۆوێن دێتە سەر لێواری سێن، ئەو ئاغا نابینێ، بەڵام ئاغا ئەو دەبینێ و چاوی لێ دەکا. ئێستا ژاك تەواو کەوتۆتە ناخی چیرۆکەکەیەوە و زەق زەق لە بینەران دەڕوانێ*). پاییز بوو، ئاغا. داروبەرد زەرد هەڵگەڕابوو.

ئاسمان شین بوو و هەروا کە بەو دارستانەدا پیاسەم دەکرد، چاوم بە کیژێك کەوت کە بۆ لای من دەهات، زۆر خۆشحاڵم لەوە کە نەهاتیە ناو قسەکانم، چونکە ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی خۆش و جوان بوو، ئەو کچەش زۆر جوان، قسەکانم پێ نەبڕی ئاغا ها، هەر لەو کاتەدا کە هێواش هێواش بەرەو لای من دەهات، لێی ورد دەبوومەوە، ئەویش چاوی لە من دەکرد، چاوم بەو ڕوخسارە جوان و خەمۆکە کەوت، ئاغا ئەو کچە زۆر خەمناك و زۆریش جوان بوو.

**سێن-ئۆوێن**: *(دواخری ئاغا دەبینێ، لەگەڵ ئەوەدا کە داچڵەکاوە)* ئای، ئەوە تۆی هاوڕێم...

*(ئاغا شمشێرەکەی لە کێلان دەردێنێ، سێن-ئۆوێن لەگەڵ کەسێک یاری دەکا و دەکەوێتە سەر زەوی).*

**ئاغا**: بەڵێ ئەوە منم، ئەو کەسەی باشترین هاوڕێی ژیانت بوو! *(پەلاماری دەدا و دەست دەکەن بە شەڕکردن)*

**سێن-ئۆوێن**: بۆ هاتوویەتە ئێرە؟ هاتووی سەرێك لە کوڕەکەت بدەی، ها؟ بۆ ئەوە هاتووی بزانی کوڕەکەت خڕوخڕپن بووە؟ تا بزانی وەک پێویست شتم داوەتێ، بیخوات؟

**ژاك**: *(لەکاتێکدا بە ترسەوە چاو لە شەڕەکە دەکا)* ئاگات لە خۆت بێ ئاغا! وریا بە! *(ماوەیەکی زۆر کورت دواتر، ئاغا سێن-ئۆوێن دەکوژێ و تەرمەکەی لە سەر زەوی دەکەوێ. ژاك دادێتەوە سەر تەرمەکە)*. پێم وابێ بۆ حەوت پشتی عاقڵ بوو. ئای، گەورەم، باشە بۆ دەبێ ڕووداوێکی ئاوەها ڕوویدا!؟

*(ژاك هەروا کە لەسەر تەرمی سێن-ئۆوێن داهاتۆتەوە، هێندێک خەڵکی گوندی هێرش دەکەنە سەر دیمەنی سێن).*

**ئاغا**: خێراکە ژاك! هەڵێ! *(ئاغا هەڵدێ)*.

## دیمەنی پێنجەم

*(ژاك ناتوانێ خۆی قوتار بکا. دەکەوێتە دەست چەند گوندنشینێك، هەر دوو دەستی لە پشتەوە دەبەستنەوە. بە دەستبەستراوی لە سەر قەراخی دیمەنەکە ڕادەوەستێ و لە هەمان کاتدا بیلیف سەرنجی دادەاتێ).*

**بیلیف**: هاورێ، پێم بڵێ هەستت چۆنە سەبارەت بە چوونەزیندان، دادگاییکردن و لە سێدارەدران؟

**ژاك**: تەنیا شتێك کە دەتوانم بە ئێوەی بڵێم ئەوەیە کە ئەفسەرەکەم دەیگوت: هەر شتێك کە لێرە، لەم سەر زەوییە و لەم خوارەوە روودەدا، گشتیان پێشتر لەو سەر سەرانە نووسراوە.

**بیلیف**: جا ئەوە راستیەکی حاشاهەڵنەگرە.

*(ئەو و گوندیەکان بە ئارامی لە دیمەنەکە دەچنە دەرێ و ژاک بە تەنیا لەسەر سێن دەمێنێتەوە تا تاکبێژی بکا).*

**ژاك**: ئێستا، باشە نرخی ئەوەی لەو سەرە نووسراوە –چیە، ئەمەیە. ئەوە بابەتێکی دیکەیە. ئاهـ. ئاغا! لەبەر ئەوەی کە تۆ عاشقی ئەو ئاگاتە حیزە بووی من دەبێ لە سێدارە بدرێم. حیکمەتەکەی لە کوێدایە، ئاغا. ئێستا ئیدی تۆ قەت ناتوانی چیرۆکی عاشق بوونی من ببیستی و ناتوانی بزانی من چۆن عاشق بووم. ئەو کچە جوان و خەمناکە خزمەتکاری کۆشك بوو، دواتر منیش هەروەکو خزمەتکارێك لەوێ دامەزرام، بەڵام تۆ قەت نازانی کۆتایی بەسەرهاتەکەم چۆنە، چونکە لە سێدارەم دەدەن، ناوی "**دێنیس**" بوو و زۆرم خۆش دەویست. دوای ئەو قەت کەسم هێندەی ئەو خۆش نەویستووە، بەڵام ئێمە تەنیا دوو حەوتوو لەگەڵ یەکتری بووین. ئاغا دەتوانی بیر لەوە بکەیتەوە، تەنیا دوو حەوتوو، چونکە ئاغاکەی ئەوکاتم، کە هەم ئاغای من بوو و هەم ئاغای ئەو، منی دا "بە کۆنت دێبۆلەی"[23]، ئەویش دواتر دامی بە برا گەورەکەی، یانی ئەفسەری رێزدار و پایەبەرز، ئەویش منی بە برازاکەی خۆی بەخشی، واتە دادوەر تولووز، ئەویش منی دا بە "کونت دۆترۆڤێل"[24]، کۆنت دوترۆڤێلیش منی بەخشی بە"مارکیز دۆبەلۆی"[25]، کە لەگەڵ پیاوێکی ئینگلیسی هەڵاتە لەندەن، سەرشۆڕییەکی گەورەی خولقاند، بەڵام راست پێش ئەوەی هەڵێ، کەڵکی لەو دەرفەتە وەرگرت بۆ ئەوەی من بسپێرێ بە جەنابی "سەروان دومارتی"[26]، بەڵێ، ئاغا، هەر ئەو جەناب سەروانەی کە دەیگوت هەموو شتێك لەو سەر سەرەوە نووسراوە، ئەویش منی بە "مستەر هەریسان"[27] دا، کە ئەودەم لە لای تۆ بوو، چونکە زۆر لاواز و سەرشێت بوو، زۆری ناڕەحەت دەکردی، چونکە هەر کاتێك تۆی ناڕاحەت دەکرد و ئازاری دەدای، من بە جەفەنگەکانم وەپێکەنینم دەخستی. تۆ زۆر ئۆگری من بووی، لەم رۆژانی پیرییەمدا زگی منت تێر دەکرد و نەتدەهێشت برسی بم، چونکە ئەو بەڵێنەت بەخۆت دابوو کە هەمیشە لە پشتم بی و فریادڕەسم بی، ئێستاش دەزانم بە بەڵێنەکەی خۆت وەفاداری، قەت لێك جیانابینەوە، ئێمەیان بۆ یەکتری دروست کردوە. ژاکیان بۆ ئاغاکەی داناوە و، ئاغاکەیان بۆ ژاك. ئێستاش گەیشتووینەتە ئێرە، جیا لە یەکتری بە هۆی گەپچاڕییەکی ئاوا گەمژانەوە! ئاخ خوای گەورە، تۆ چلۆن ئیزن دەدەی کە ئەو پەستییە بە سەر تۆدا زاڵ بێ!

بۆ دەبێ من لەبەر ساویلکەیی و مرخی خراپی تۆ لە سێدارە درێم؟ ئەو شتە گەمژانەیە چین کە لەو بان سەرەوە نووسیوتن. ئاخ ئاغا، ئاخ لە دەستانت. ئەو کەسەی بەسەرهاتەکانمانی نووسیوە دیارە دەبێ

---

[23] - contede boullay.

[24] - comtede trouville

[25] - marquie de belloy

[26] - captime de marty

[27] - monsieur herissont

شاعیرێکی زۆر خراپ بێ، لە نموونەی خراپترین شاعیرەکان، لە وێنەی پاشا و ئیمپراتۆر و شاعیری خراپ!

*(لە کاتی وتنەوەی ئەو دێرانەی ژاکدا، بیگری لاو دێتە سەر قەراخی دیمەنەکە، رادەوەستێ و بە دوودڵیەوە چاوی لێ دەکا، دواتر بانگی دەکا).*

**بیگری لاو**: ژاک؟

**ژاک**: *(بە بێ ئەوەی چاوی لێ بکا)* لێم گەڕێ، بەنەعلەت بی!

**بیگری لاو**: ژاک، ئەوە تۆی؟

**ژاک**: هەمووتان بڕۆن ون بن لە پێش چاوم! خەریکم لەگەڵ ئاغاکەم قسە دەکەم!

**بیگری لاو**: ژاک، هەی نەعلەت بی، دەڵێی نامناسیەوە؟

*(ژاک دەگرێ، دەیسووڕێنێ بۆ ئەوەی چاو لە چاوی بکا و بەرامبەر بە یەکتری راوەستن).*

**ژاک**: بیگر.

**بیگری لاو**: بۆچی دەستیان بەستووی؟

**ژاک**: لە سیدارەم دەدەن.

**بیگری لاو**: لە سێدارەت دەدەن؟ نا... چۆن شتی وا دەبێ، هاوڕێ؟ بە خۆشیەوە هێشتا لەم دنیایەدا هاوڕێی وا هەن کە هاوڕێکانیان لە بیر نەکردبێ *(ئەو پەتەی دەستی ژاکی پێ بەستراوە دەکاتەوە و دووبارە بۆ لای خۆی دەیسوڕێنێتەوە بۆ ئەوەی جارێکی دیکەش رووی لەلای ئەو بێ و لە باوەشی دەگرێ. هێشتا هەر لە باوەشی یەکتردان، ژاک پێدەکەنێ)* بە چی پێدەکەنی؟

**ژاک**: ئێستا خەریکی سەرکۆنەکردنی شاعیرێکی خراپ بووم لەبەر ئەوەی کە شاعیرێکی خراپە، ئەویش وادیارە بۆ راستکردنەوەی شیعرە خراپەکەی، جگە لەوەی تۆ بنێرێتە لام هیچی دیکەی لە دەست نەهات. بیگر با ئەوەش بڵێم، تەنانەت خراپترین شاعیرەکانیش نەیاندەتوانی کۆتاییەکی هێندە خۆش بۆ شێعرەکانیان دانێن!

**بیگری لاو**: هاوڕێ، باوەڕ بکە تەنانەت لە تاقە یەک وشەی قسەکانت تێناگەم، بەڵام، قەینا، ئەوە گرنگ نییە! من تۆم قەت لە بیر نەچۆتەوە. ژووری بەر هەیوانەکەت لەبیر ماوە؟ *(ئێستا ئەویش پێدەکەنێ. دەستێك لە ژاك دەدا. ژاکیش پێدەکەنێ)*. ئەوەی دەبینی *(ژووری بەر هەیوانی دیمەنەکەی سەرەوە نیشان دەدا)* برام، ئەوێ ژووری بەر هەیوانەکەی منە! ئەوێ شوێنێکی پیرۆزە، کلیسایە، پەرستگایە! پەرستگای دۆستایەتی راستەقینە! ژاك، نازانی چەندەت خۆشحاڵ کردوین! لەبیرت ماوە کەی چوویە ناو ئەرتەشەوە؟ زۆر باشە، مانگێك دواتر زانیم کە ژووستین ... *(بە شێوەیەکی پڕ واتا رادەوەستێ)*.

**ژاک**: دەی چی لێهاتووە؟

**بیگری لاو:** کە ژووستین... *(ڕاوەستانێکی ماناداری دیکەش)*... بڕیارە *(جارێکی دیکەش رادەوەستێ)* باشە، تۆ خۆت شکت بۆچی دەچێ!... منداڵێك.

**ژاك:** مانگێك پاش چوونی من بۆ ئەرتەش ئەوجار بەو شتەت زانی؟

**بیگری لاو:** باوکم هیچی پێ نەبوو بو گوتن، هیچی پێ نەدەگوترا؟ هیچ رێگایەکی دیکەی نەما جگە لەوەی کە ئیزنم بدا بیهێنم. هەشت مانگ دواتر... *(بێدەنگیەکی پڕ مانا)*.

**ژاك:** دەی دوایە چی بوو؟

**بیگری لاو:** منداڵێکی بوو!

**ژاك:** ئێستا چۆنە؟

**بیگری لاو:** *(بە فیزەوە)* باش، زۆر باشە! بە حورمەتی تۆ ناومان ناوە ژاك! باوەڕ دەکەی یان نا، زۆریش شێوەی تۆ دەدا و لە تۆ دەچێ. دەبێ بێی بیبینی! ژووستین لە خۆشیان حەپەسابوو!

**ژاك:** *(لەکاتێکدا چاو لە بەر پێی خۆی دەکا)* ئای ئاغا چکۆلە خۆشەویستەکەم، چارەنووسەکانمان بە شێوەیەکی پێکەنیناوی زۆر لە یەکتری دەچن... *(بیگری لاو بە ریزێکی زۆرەوە بەرەو دەرەوەی دەبا)*.

## دیمەنی شەشەم

**ئاغا:** *(دێتە سەر سێنەکە کە چۆڵە و بە خەمناکیەوە بانگی ژاك دەکا)*. ژاك! ژاك، کوڕم! *(چاو لە دەوروبەری دەکا)*. لەو کاتەوە تۆم لێ ونی، دیمەنەکە بە رادەی دنیا چۆڵە و دنیاش بە رادەی دیمەنەکە چۆڵە. رووت و قوتە، با هیچ شتێکم نەبێ، بەس تۆم هەبێ و جارێکیتر چیرۆکی شیر و کێلانم بۆ بگێڕیەوە. ئەو چیرۆکە جاڕزکەر و ناخۆشە. ئەوکات دەمتوانی پێم خۆش نەبێ و بێ پەردە بڵێم چیرۆکێکی قۆڕ و بێ کەڵکە و تۆ دەتتوانی دووبارە بیگێڕیەوە و هەموو جارێکیش وەهای بگێڕیەوە وەك بۆ یەکەم جارە ئەو چیرۆکە دەگێڕییەوە... ئاخ، ژاك، کوڕم، خۆزگە چیرۆکی سێن-ئۆوێنیش هەر وەک ئەم چیرۆکەی تۆ بووایە، بەڵام هەر دەتوانم چیرۆکە خۆشەکانی تۆ رەد بکەمەوە، پەیوەندیی ناڕەوا و گەمژانەی من رەت ناکرێتەوە. ئێستا تاك و تەنیام *(ئەو بە شێویەك کە وەك لە خەیاڵدا بژی ئەو دێڕانەی خوارەوە بە جۆرێك لەبەر دەخوێنێتەوە کە وەك بڵێی هی قەسیدەیەکن)* سڵاو، ئەی مانگی چواردەی گەشاوە ... *(بە دەنگی ئاسایی خۆی)* قسەکەی تۆ راست بوو، تۆ دەزانی هیچ کاممان نازانین بۆ کوێ دەچین. پێم وابوو سەرێك لە زۆڵەکەم دەدەم، بەڵام کەچی لە باتی ئەوە ژاکە بچکۆلە خۆشەویستەکەم لێ ون بوو.

**ژاك:** *(لەکاتێکدا لە لا یەکی دیکەوە بەرەو لای ئاغا دێ)* ئاغا بچکۆلە خۆشەویستەکەم...

**ئاغا:** *(بەسەر سوڕماوی ئاوڕ دەداتەوە بۆ لای ژاك)*. ژاك!

**ژاک:** ئەوەی ئەو ژنە رەسەنە خاوەن میوانخانە قوون گەورەکە لە سەر ئێمە گوتی وەبیری خۆت بێنەوە: ئێمە ناتوانین بەبێ یەکتری بژین. *(ئاغا دەهەژێ و هەست دەیگرێ. خۆ لە باوەشی ژاك داوێ و ژاك دڵنەوایی دەداتەوە).* ئێستا پێم بڵێ بۆ کوێ دەچین؟

**ئاغا:** ئێمە کێمان دەزانین دەچینە کوێ؟

**ژاك:** کەس نازانێ.

**ئاغا:** کەس.

**ژاك:** جا کەوابوو، تۆ ببە بە چاوساغ.

**ئاغا:** من کە خۆشم نازانم دەچینە کوێ، چۆن دەتوانم ببمە رێنیشاندەر؟

**ژاك:** چونکە لەو سەرە ئاوایان نووسیوە. تۆ ئاغای منی و ئەرکی تۆیە کە رێگام نیشان بدەی.

**ئاغا:** راست دەکەی، بەڵام مەگەر ئەوەت لەبیر چۆتەوە هەر تۆزێك دواتر چی نووسراوە؟ هەر ئەوە کە دەڵێ ئاغا فەرمانەکان دەدا، بەڵام ژاك لە نێوانیاندا هەڵدەبژێرێ. زۆر باشە؟ چاوەڕێم!

**ژاك:** زۆر چاکە، راستە. من پێم خۆشە تۆ رێگام نیشان دەی... بۆ پێشەوە...

**ئاغا:** *(چاو لە دەوروبەری خۆی دەکا، زۆر دەستەوەستانە)* زۆر باشە، بەڵام کوا، پێت وایە ئێرە بەرەوپێشەوەیە؟

**ژاك:** ئیزنم بدە نهێنیەکی گەورەت پێ بڵێم. یەکێك لە کۆنترین فێڵەکانی مرۆڤ ئەوەیە کە بەرەوپێش واتە هەر شوێنێك کە ئەو پێی وایە بەرەوپێشە.

**ئاغا:** *(سەر دەسوورێنێ)* هەر شوێنێك؟

**ژاك:** *(لەکاتێکدا بە دەستێك بازنەیەکی گەورە دەکێشێتەوە)* چاو لە هەر شوێنێك بکەی، بەرەو پێشەوەیە!

**ئاغا:** *(بێ هیچ هەست و زەوقێک)* ئەوە زۆر باشە، ژاك! ئەوە شتێکی زۆر باشە! *(هەر لە جێی خۆیدا و بە ئارامی دەسوورێ).*

**ژاك:** *(بە خەمناکیەوە)* بەڵێ، گەورەم. منیش پێم وایە زۆر باشە.

**ئاغا:** *(دوای ماوەیەکی کورت، بە خەمۆکیەوە)* باشە ژاک، کەواتە بۆ پێشەوە!

*(لارەولار و یاری یاری لە دیمەنی سەرسێنەکە دەچنە دەرێ...)*

**"پراگ، ژووئیەی 1977"**
**میلان کۆندێرا**

**کۆتایی**

# JACQUEA
## AND
# HIS MASTER

*DRAMA*

***Milan Kundera*** (1977)

Translated to kurdish*:*

***Rand Zarei*** (2020)

تێبینی:

- فایلی دەنگی کوردی ئەم پەڕتووکە بە دەنگی وەرگێڕ لەبەر دەستتدایە و دەتوانی بێبەرامبەر گوێی بدەیە.